لە ژمارە 64 ی تشرینی دوەم و کانونی یەکەمی ساڵی 1977 ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» دا، گوتارێک لە ژێر ناونیشانی «کوردواتەنی» دا بڵاو کرایەوە، کۆمەڵێک ڕەخنەی لە دوو نووسینەکەی من «فۆنەتیک چیمان بۆ بکا؟» و «چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی» گرتبوو، وەک دەشزانین ڕەخنەگرتن مافی بێ دەمەتەقەی نووسەران و خاوەن بیرانە. لەم ڕوانگەوە خۆشامەدیی لە هەموو ڕەخنەکان دەکەم، بەڵام دوو تێبینی گشتییم لە بارەی ئەو ڕەخنانە و هەموو ڕەخنەیێکی دیکەش هەیە. یەکەمیان ئەوەیە ڕەخنەگر لەسەریەتی شتێکی باشتر لە ڕەخنەلێگیراوەکە پێشکەش بکات نەک تەنها مەیلی خۆ هەڵدانەوە پاڵی پێوە بنێ بۆ ڕەشکردنەوەی ڕەمەکیی چەند لاپەڕەیەک. دوەمیان ئەوەیە، پێویستە لایەنی ناحەزایەتیی و کەفوکوڵی دەروون تێکەڵ بە بابەت نەکرێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی خوێندەوارەکانمان بەو پیشە نارەوایە ڕانەیەن. پێویستیشە بڵێم، ئەو نووسەرەی لە زەمینەی وەرام دانەوەی هێرشدا دەمودووی ناحەزانە بەکار دەهێنێت گوناهی ئەو نووسەرەی نییە کە هەروا بەرمەیدان و بێلزوم مل لە هێرش بردن دەنێت. مافی لەسەرخۆکردنەوە، لە حاڵەتی ڕەدکردنەوەی هێرشدا، دەچێتە پاڵ مافی ڕەخنەگرتن و دەستە تەرازووی گلەیی لێکردنی سووک هەڵدەستێنێتەوە.

لەگەڵ ئەو دوو تێبینییەشدا بەوپەڕی باخەڵ فەراحییەوە سەیری گوتارەکەم کردوە و پتر لە خاوەنی پەرۆشدارم بۆ ئەو هەموو هەڵە و ناتەواوییانەی تێیدان. هەر بۆ تاکە مەبەستی سوودی لێکۆڵەرەوە نەوباوەکانی ڕێزمانی کوردیش ویستم بایی پێویست ڕۆشنایی بیروڕای خۆم (ئەگەر هیچ ڕۆشنایەکیان تێدا بێت) بۆ لایەنە ناتەواوەکانی ئەو گوتارە بهاوێژم. ئەوەی ڕاستیش بێ، ترسی هەڵەی چاپ خستمیە سەر باری لەچاپ دانی ئەم نووسینەم لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد چونکە من لە بارێکدا نیم بتوانم سەراسۆیی چاپ کردنی نووسینەکەم لە دەرەوەی کۆڕ بکەم، زۆر جارانیش هەڵەی بچووک سوودی

گەورە دەدۆڕێنێت. وام پەسەند کرد کە وا پێبەپێی ناتەواویەکانی گوتارەکە بەسەریدا بڕۆم.

لە ستوونی یەکەمی گوتارەکە دەخوێنیتەوە «چەند هەزار ساڵێ لەمەوبەرتر». وشەی لەمەوبەرتر لێرەدا هەڵەیە چونکە پلەی Comparative بۆ بەراورد کردنی نێوان دوو لایەنانە، لێرەشدا هەر یەک لایەن هەیە ئەویش ڕۆژگاری چەند هەزار ساڵ «لەمەوبەر» ە. ئەگەر گوتارەکە مافی تەواوی بە ڕێزمان دابایە دەبوو بڵێ «چەند هەزار ساڵێ لەمەوبەر». کاتێک بمانەوێ ڕابردوویەک لە یەکێکی دیکە بەرەژووتر ببەین ڕێمان دەبێ لەمەوبەرتر بەکاربهێنن وەک کە بڵێین «ساسانیەکان لە عەباسیەکان لەمەوبەرترن». وا دەزانم ئەمە ڕاستییەکی زێدە سەرەتای زمانزانییە، جا ئەگەر لە مەیدانی پێداگرتندا نموونەی وەک ئەم هەڵەیە لە نووسینی وەک خۆی بهێنرێتەوە دەبێتە هەڵەی برای هەڵە. وا پێ دەچێ یاریدەدەری گوتارەکە جارێ ماویەتی لە کوردیدا، یاخود لە نووسیندا، ڕەگ داکوتاو بێ، ئەمەش شتێکی سەیر و سەمەرە نییە چونکە فراژی بوون کاتی دەوێ.

بە دوا ئەو وشەیەدا نووسراوە «زمانی سەرپاکی سەرانسەری خاکی کوردستان»، وا باش بوو بگوترێ «زمانی سەرپاکی کورد و سەرانسەری خاکی کوردستان». دەشێ وشەی کورد لە کاتی چاپ کردن پەڕی بێت وەیاخود نووسەر لە بیری کردبێت...

لە ستوونی دوەمی گوتارەکە ئەم ڕستەیە لە چاوان دەچەقێت «سەرەڕای ئەوەش کەچی هێشتا ئاوێستا، ئێستە هەر بە زمانێکی مردوو لە قەڵەم دەدرێ...». ئەم ڕستەیە لەم شێوەیەدا پێی ناڵێن «ڕستەی کوردیی شێوەی ئەدەبی» ئەوەی ڕاستی بێ ناشێ بە ئاخاوتنی عادەتیش حیساب بکرێ چونکە یەکجار کز و لاواز و پڕ هەڵەیە. جارێ لە پێشەوە دەبێ بڵێم نووسەر مەبەستی لە «سەرەڕا» واتایێکی وەک «رغم ذلک» یە نەک «بالأضافة الی ذلک»

لەبەر ئەمە وشەی سەرەڕا بۆ ئێرە دەست نادات و دەبێ بە «لەگەڵ ئەمەشدا» بگۆڕدرێت. ئنجا وشەی «کەچی» دەڵێی دومەڵە بەسەر سنگی ڕستەکەوە، ئەویش دەبێ بە دەمی نشتەری خامە بسڕێتەوە. دوای ئەمانەش لە خۆوە دیارە وشەی «هێشتا» و «ئێستە» یەک شتن و لەیەک ڕستەدا کۆ نابنەوە، کە کۆش کرانەوە هەڵە پێک دەهێنن. بەو پێیە ئەگەر ڕستەکە لێی بقرتێت و تاوتۆ بکرێت بۆ باریکی پەسەند ئەمەی لێ شین دەبێتەوە «لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا ئاوێستا هەر بە زمانێکی مردوو لە قەڵەم دەدرێ». خۆ ئەگەر لە دوو وشەی «هێشتا» و «هەر» یەکێکیان بەلاوە بنرێت ڕستەکە بێ عەیبتر دەبێت. «لەگەڵ ئەمەشدا ئاوێستا هەر بە زمانێکی مردوو...». بەڵام بەمەدا واتا و مەبەستی ڕستەکە لە چەنگ ڕەخنە قوتار نابێت چونکە «ئاڤێستا» ئەو مردووە نییە. کەسێک ئاگاداری جموجۆڵی زەردەشتییەکانی ئێران و ئەولاتری ئێران بێ دەبینێ ئەدەبیات و دەستووراتی ئاڤێستا ڕۆژ لە ڕۆژ پتر هێز وەردەگرن و چالاکتر بەسەر زار و زمان و قەڵەمانیشدا دێن و دەچن. زمانی ئاڤێستا وەک زمانی سۆمەر و ئەکەد نییە لە بیران چووبێتەوە، تەنانەت وەک زمانی لاتینی کۆنیش نییە هەر لە مێشکی مامۆستایاندا بژیت چونکە ئاڤێستا وەک تەورات پێوەندیی بە بیروباوەڕی غەیبییەوە هەیە و پێڕەوەکانی نوێژی پێ دەکەن و لەبەر خوا دەپاڕێنەوە و قوربانیی ئاینیی ئەو زمانە و دینە لە خۆیان دەگرن... بەرەیێکی دیاری ئێرانی و ئێرانناسەکانی فارس لەم ڕۆژگارەدا بە چالاکی خەریکی بوژاندنەوە و گەشەپێدانی ئاڤێستا و دینی زەردەشتن، وەک بزانم دەوڵەتی ئێرانیش دانی بە بوونیاندا هێناوە لەمەشدا هەر دەڵێی فەرمانەکەی خەلیفەی دووەم «عومەری خەتاب» کە زەردەشتییەکانی بە «أهل الكتاب» دانا هەڵگێراوەتەوە. خولاسە، بە مردوو دانانی زمانی ئاڤێستا و دینی زەردەشت وەها بە سەرپێیی نابێت، ئەو سەرچاوەی قسەی وەهاشی لێ وەرگیرابێ دیارە پەلەی کردوە و نەختێکیش خلیسکی بردوە. بەهەمەحاڵ ئەم هەڵەیە بۆ لایەنی زمانناسیی گوتارەکە ناچێتەوە.

هەر لەو مەسەلەیەی مردووەتی ئاڤێستادا هەڵەییەکی فکری دیکە هەیە پێی دەڵێن «تناقض»، واتە خۆهەڵوەشاندنەوە، لەوەدا کە گوتارەکە لە پێشەوە ڕایەکی ناپوخت دەردەبڕێ لە بارەی هۆی مەیین و وەستانی زمانەکەوە کە دەیداتەوە بە مردنی ئەو گەلەی قسەی پێ دەکەن، هەر بە دوا ئەوەشدا دەڵێ زمانی ئاڤێستا مردووە کەچی دەشڵێ بۆ ماوەی دوورودرێژ زمانی «سەرپاکی سەرانسەری» کوردستان بوە. خۆ دەشزانین، گوتارەکەش دەڵێ، کورد زیندووە. ئنجا خوێنەر با سەیری ئەم خۆپاشگەز کردنەوەیە بکات:

زمان دەمرێ، دەمەیێ چونکە ئەو خەڵکەی قسەی پێ دەکەن مردوون.
ئاڤێستایی زمانێکی مردووە.
ئاڤێستایی زمانی دێرینەی هەموو کوردستان بووە.
کورد نەمردووە.

بێگومان ئەم تەرزە قسانە مایەی دڵگەرمیی و پەلەپەل و کەم لێکدانەوەیە: بە کوردی، بەچکەی عاتیفەیە و بەس.

بەیەکەوە بەسترانی چارەنووسی زمان و خاوەنەکەی وەها سادە و «متناقض» نییە. وا دەبێ زمان دەمرێت و گەل بەردەوام دەبێت «قیبتییەکان زمانیان بوو بە عەرەبی و کەسیش لەناوی نەبردن». ناوناوەییێکیش دەبینی زمانی نژادیی هێندە گۆڕانی بەسەردا دێت پێوەندیی بە ڕابردوویەوە نامێنێت وەیا زۆر بێهێز دەبێت هەرچەند خاوەنەکەشی زیندووە - عەرەبی یەمەن هەر ماون بەڵام زمانی کۆنیان لە ئاخاوتندا نەماوە، پێشی نانووسرێت، تەنانەت زمانی عەرەبی بە تێکڕایی ئەگەر شێوەی پێش ئیسلامی لە نووسین و کتێباندا نەژیابا، ئێستا ئەویش بە نیسبەت ئاخاوتنی عەرەبییەوە وەک زمانی ئاڤێستای لێ بەسەر دەهات. فەرموو قسەی خەڵقی تونس بەم بەیتە بگرە:

هیق هجف و زفانیة مرطی
زعراء ڕیش جنحیها هرامیل

به یەکەوە مردن و ژیانی زمان و مرۆڤ باسێکە وەها بە پەلە ئەنجام نادرێت...

لە سەرەتاکانی ستوونی سێیەمی گوتارەکە ڕستەیێکی نالەبار هەیە هەم لە ڕووی ڕێزمانەوە هەم لە ڕووی فکرەوە تا بڵێی هەژارە، ئنجا دارشتنەکەشی لە حەدبەدەر کزە. ڕستەکە ئەمەیە «... ئەگەر ویسترا بەسەرهات و دۆستایەتی و ئاڵوگۆڕی باری ئابووریی کۆمەڵایەتیی گەلێ بزانی، یەکێ لەو ڕێگایانەی دەت گەیێنێتە ئاوات و ئامانج گرتنی ڕێگای لێکۆڵینەوەی مێژوویی وشەیە - لە کوێوە هاتووە؟ لە کەیەوە هاتووە؟ واتە: «ئیتۆمۆلۆژی» وشەی زمان».

1- لە لایەن ڕێزمانەوە: کە گوتت «ئەگەر ویسترا...» ڕێ هەیە لە کۆتاییدا بڵێ «دەبێ بزانرێ» نەک «دەبێ بزانێ» چونکە کە سەرەتای ڕستە «مبنی للمجهول» ی کەسی سێیەم بێت ناشێ دوایی ڕستەکە «مبنی للمعلوم» ی کەسی دوەم بێت. ڕاست ئەوەیە سەرەتای ڕستەکە «ئەگەر ویستت» بێت لەوە بەولاوە هەموو کەسەکانی ناو ڕستەکە «کە کەسی دوەمن» ڕاست دەردەچن. ئەم تێبینییەش لەوانە نییە سەرپێچی تێدا بکرێت مەگەر بە نیازی نەسەلماندنی دڵگەرمانە...

2- لە ڕووی تەعبیرەوە، باوەڕ ناکەم کەس هەبێ بتوانێ بڵێ من هیچ واتاییێکی تەواوی ئەو کۆمەڵە وشانە لە خودی وشەکانەوە تێدەگەم چونکە کە باسی «دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕی باری ئابووری کۆمەڵایەتیی!!» دەکات خەیاڵ بۆ پێوەندیی نێوان «گەلان» دەڕوات، بە تایبەتی کە دەیەوێ لە ڕێی هاتنی «وشە» بۆ ناو زمان ئەو دۆستایەتییە و ئاڵوگۆڕە!! بزانێت چونکە دیارە هاتنی وشە بۆ ناو زمان دەبێ لە زمانێکی دیکەوە تەصور بکرێ کەچی دەقی ڕستەکان پێوەندیی نێو گەلان بە دەستەوە نادات چونکە «دۆستایەتیی و

ئاڵوگۆڕ... گەلێ» دەکاتەوە یەک گەل. ئنجا چۆن دەشێ گەل دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕ (تبادل) لەگەڵ خۆیدا بکات. من لە زمانی حاڵی وشەکانەوە دەزانم مەبەستی عیبارەتەکە چییە نەک لە واتایانەوە چونکە لەسەر واتایەک ڕاناوەستن. دەزانم کە دەڵێ «وشە لە کوێوە هاتوە؟ لەکەیەوە هاتوە؟» دەیەوێ بڵێ هاتنی وشەی بێگانە بۆ ناو زمانێک پێوەندیی نێوان خاوەنی وشەکە و ئەو میللەتەی وەریگرتووە نیشان دەدات، وەک ئەوەی کە پەیدا بوونی وشەی «ورشە» لە میسری سەدەی نۆزدەمدا ئەوە ڕادەگەیەنێ کە میسر پێوەندی نزیکی بە ئینگلیزەوە بووە چونکە دیارە وشەکە لە Workshop ەوە وەرگیراوە.

3- لە ڕووی فکرەوە، هەرچەند گوتارەکە لێرەدا بیروڕای نێو کتێبان دەداتەوە، بەڵام نەیتوانیوە کەم و زۆر ڕووناکی و دروستیی و وردی و نیشانپێکانی ئەو بیروڕایانە ڕابگەیەنێت، هەر دەڵێی تەعبیرەکانی لە ناو شەپۆلی ئەو کتێبانەدا خنکاوە. خنکانەکەشی بەهۆی نەفەسکورتیی خۆ ڕوونکردنەوە و ناپوختیی ڕستەکان و لێڵی «فکر» ی گوتارەکەوە بووە. ئێتیمۆلۆجی هەرگیز بە تاکە هۆی گرتنەبەری «ڕێگای لێکۆڵینەوەی مێژوویی وشە» نامگەیەنێتە ئاوات و ئامانج ئەگەر بمەوێ لە ڕێی زانینی «لە کوێوە؟ لەکەیەوە؟» ی هاتنی وشە بۆ ناو زمانێک «... دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕی ئابووری کۆمەڵایەتی گەلێ» بزانم چونکە ئەم قسانە دەیێکی ئەو پێوەندییە جۆراوجۆرەی نێوان گەلانم نیشان نادەن کە لە ڕێی غەیری «دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕی ئابووری کۆمەڵایەتیی» یەوە گەلان بەیەکەوە دەلکێنن ئیتر یا لکاندنی دۆستانە بێت وەیا دوشمنانە بێت، لە شێوەی ئابووری کۆمەڵایەتیی دا بێت یا لە شێوەی دیکەی وەک ئایین، ئەدەب، فەن بێت، بە ئاڵوگۆڕ بێت وەیا بە سەپاندن و کەنەفت کردن بێت. خولاسە ئەم کوتانەوەی ئابووریی کۆمەڵایەتیی لەم جێگەیەدا خۆ دانە بەر شەپۆلێکی باوی نووسینی ئەم ڕۆژگارەیە بێ ئەوەی پێوەندی ژیوەری بە بابەتەوە هەبێت چونکە مەعلومە بەرەکەتەکانی ئابووریی کۆمەڵایەتیی بەر لە سەدان ساڵ لە نێوان نحوسەتی دەیەها پیوەندی ناڕەوا و دڕندەدا دەخنکان،

تەنانەت ئەگەر پێوەندییە چاکەکان و نە چاک نە خراپەکانیش بە بەرچاومانەوە بگرین دیسان کەڵەکە لەسەر ئابووری کۆمەڵایەتیی دەکەن وەک کە، بە داخەوە، دوشمنایەتیش لە کۆندا فرزەی لە دۆستایەتیی دەبڕی...

سەرنج لە ڕستەی دواتر بگرە کە دەڵێ «بەهۆی وردبوونەوەی مێژووی ئەو وشانەوە... هەن و نییەی ئەو وشانەمان بۆ دەردەکەوێ، ئەو وشەیە لە کوێوە هاتوە! بەهۆی چییەوە هاتوە، هۆی هاتنیی... لە چە دراوسێیەکەوە وەرگیراوە...! هتد» سەرلەنوێ بە داڕشتنێکی کز و ناتەواوەوە واتا و مەبەستەکانی عیبارەتی پێشوتر دەڵێتەوە، تەنانەت ڕستەکە زۆر بە هەژاری وشەی «کوێ» ی عیبارەتی پێشوو دووبارە دەکاتەوە بێ ئەوەی مەبەستێکی تازە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. لەوەش بترازی ڕستەکە لە ناوەڕۆکی خۆشیدا وشەکان دەکوتێتەوە «بەهۆی چییەوە هاتوە، هۆی هاتنیی[1]» ، ئنجا کە دەڵێ «لە کوێوە هاتوە» هێندە نابات دەڵێ «لە چە دراوسێیەکەوە وەرگیراوە...! هتد». کێ دەتوانێ پێم بڵێ فەرقی نێوان «لە کوێوە» و «لە چە دراوسێیەکەوە» چییە!

بەهەمەحاڵ گوتارەکە لێرەدا ئەوەندەی چاک کردوە کە بەهۆی «هتد» ەوە خۆی لە دەردی سەری تەعبیری زەحمەت ڕزگار کردوە، هەرچەند ئەو مەبەست و واتایەی قسە ناتەواوەکان جینگڵی تێدا دەخۆن چ زەحمەتێکی ئەوتۆی تێدا نییە و هەموو دەست و قەڵەمی شلکیش پێی دەوێرێ.

---

[1] - نووسەران لە دوای ئەو وشانەی کۆتاییان بە «ی» دێت دێن بۆ کەسی سێیەمی تاکیش «ی» ەکی دیکە قەتار دەکەن، بەڵام لێرەدا هاتنی دوو «ی» بە هیچ مەزهەبان دروست نییە چونکە وشەی «هاتن» چ «ی» پێوە نییە تاکو بڵێین لەگەڵ ڕاناوەکەی کەسی سییەمدا دەبن بە دوو. ناشزانم بۆچی گوتارەکە لە جێگەی «چ» هەر دەنووسێ «چە» کە ئەمە فارسییە و کوردی نییە.

لە ڕستەکەی دووەمدا تەعبیرێکی زۆر ناکوردییانە و ناشارەزایانە هەیە کە دەڵێ «بەهۆی ورد بوونەوەی مێژووی ئەو وشانەوە...» وەک لە خۆوە دیارە، داڕشتنی ڕستەکە وا ڕادەگەیەنێ کە بەهۆی وردوخاش بوونەوەی مێژووی وشەکان فلانە شت و فیسار حاڵەت ڕوون دەبنەوە. چ بەهانەی هەڵەی چاپیش لەو داڕشتنەدا بە چنگ ناکەوێ چونکە بە عادەت ئەو وشە و ڕستەیەی هەڵەی چاپی تێدایە شونێکی مەیلەو دیتراوی ئەسڵەکەی تێدا دەمێنێ، بەڵام لێرەدا شونی وەها پەیدا نییە چونکە ئەو ئەداتی «ی» ی ئیزافەی نێوان «وردبوونەوە» و «مێژووی ئەو وشانەوە...» وەها جێی خۆی گرتووە لێناگەڕێ بڵێین هەڵەی چاپ «وردبوونەوە لە مێژوو...» ی کردوە بە «وردبوونەوەی مێژوو...» چونکە کۆتایی عیبارەتەکە ئەم تەئویلە ڕەت دەکاتەوە. تۆ ناتوانی بڵێی «بەهۆی وردبوونەوە لە مێژووی ئەو وشانەوە» - لەم حاڵەتەدا ڕاست ئەوەیە بگوترێ - بەهۆی وردبوونەوە لە مێژووی ئەو وشانە». بە هەمەحاڵ من لە خۆمەوە ئیحتیمالی هەڵەی چاپ دەهێنمە ناو قسان، دەنا گوتارەکە هێندە گوێی نەداوەتە ئەو تەرزە وردەکارییە...

هەر بە دوا ئەو ڕستەیەدا، لە هەمان ستوونی سێیەمی گوتارەکەدا، دەخوێنیتەوە «ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە زۆر بە چاکیی و چالاکییانە لایەکی گەورەی مێژوو... ڕۆشن دەکاتەوە». ئەم وشەیەی «چالاکییانە» هەڵەیێکی ڕێزمانی زۆر زەقە. یا دەبێ بگوترێ «بە چاکی و چالاکی» وەیا بگوترێ «بە چاکی و چالاکانە» چونکە ڕێژەی وەک «پیاوانە، کوردانە، ژیرانە...» تەنها لەگەڵ وشەی مادیدا دێن ئیتر یا ناو بێت یا ئاوەڵناو، بە نموونە سەیری ئەم ڕێژانە بکە، عەقڵانە، هۆشانە، سۆزانە - هەڵبەت دەبێ بکرێتە، عاقڵانە، هۆشیارانە، سۆزناکانە... وشەی «چالاکی» ش ناوی مەعنەوییە، هەڵناگرێ لەو ڕێژەیەدا ببێتە «وصف — بۆ فعل یا برا فعل وەک «خۆراک و پۆشاک...» کە ئەمەش لە ڕێزماندا درێژەی هەیە و لێرەدا لێی نابینەوە - بە نموونە، دەگوترێ «خۆراکی کوردانە، پۆشاکی ژنانە».

لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە 19 ی گۆڤارەکە هەندێ قسەی وەک بەدیهی دەدیترێ، بەڵام کە لێی ورد دەبیتەوە هیچ واتا بە دەستەوە نادەن. مانای چی زمانی کوردی «هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان تا ڕادەی ترووکەی چاویش گەلی کوردی بەجێ نەهێشتوە»؟ کەس بەتەما بووە زمان گەلەکەی بەجێ بهێڵێ؟ کەس شتێکی وەها گوتووە؟ هیچ زمانێک لە دەسەڵاتیدا هەبووە گەلەکەی بەجێ بهێڵێ...؟ ئەمە هەر قسەیە و بەس لە خوێندەواری تێهەڵکشیو ناسەلمێندرێ، ئنجا ناشگوترێ «تا ڕادەی تروکەی چاو...» چونکە «ڕادە» بۆ «پلە» ی شتان بەکار دێت نەک «مقدار» ی شتان. دەبێ بگوترێ «بەقەدەر ترووکەی چاو، بایی ترووکەی چاو، هێندەی ترووکەی چاو...» ئەوەی وەهاشی بەکارنەهێنێت و بۆ مقداری شتانی بباتەوە شەڕ بە زمانەکە دەفرۆشێ وەک ئەوەی لە عەرەبیدا بڵێی «لا أغفل عنك بدرجة لحظة عين» لە جیاتی «قدر لحظة عين».

هەر لەو دێڕانەی سەرەتاکانی ئەو ستوونەدا نووسراوە «زمانی کوردی... پارێزگاریی ڕەسەنیەتی ڕێزمان و دەنگسازیی خۆی کردوە...». بەڕاستی کەس تێناگا مەبەس چییە لەوەی بگوترێ «ڕەسەنیەتی دەنگسازیی خۆی» چونکە کەس نازانێ دوو سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەم کوردە دەنگەکانی ئاخاوتنی خۆی چۆن دەربڕیوە تاکوو بتوانین دان بەوەدا بهێنین کە دەنگەکانی ئێستاکەی هەمان دەنگی ڕۆژگاری زەردەشتە. لەم سەردەمەدا مەنگوڕ و خۆشناو جوداوازیی نێوان هەندێک لە دەنگەکانی ئاخاوتنیان تێدا هەست پێ دەکرێ ئیتر نازانین بە چ مەبەستێکەوە بڵێین ڕەسەنیەتیی دەنگسازییان پاراستوە! کامیان ڕەسەنە؟ بۆچی ئەوەیان ڕەسەنە؟ بەڵگە چییە؟ ئنجا نابێ بشگوترێ «ڕەسەنیەتی دەنگسازی» چونکە وشەی «دەنگسازی» بۆ لای زانستی دەنگمان دەباتەوە کە دەزانین نە کورد و نە هیچ میللەتێکی دیکە ئاگای لە «دەنگسازی» نەبوە تاکوو بیپارێزێ یا شتێکی دیکەی لەگەڵدا بکات. لەمەش بترازێ، ئەگەر بە بیری خۆماندا بهێنین کە دەنگی بێگانەش تێکەڵ بە

دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردی بوون ئیتر بە جارێ لەو ڕەسەنیەتیەی دەنگسازی نابەڵەد دەبین. ئێمە کە نەزانین دەنگەکانی زمانەکەمان لە کۆندا چۆن دەبڕاون، لە ئێستاکەشدا جوداوازیەکی ئاشکرا لە نێوان دەنگەکانی زارە جوداکانی زمانەکەمان دیاردەییێکی بێ دەمەتەقە بێت، بشزانین دەنگی نارەسەن کەوتۆتە نێو زمانەکەمان ئیتر چۆن لە مەبەستی ئەو «ڕەسەنیەتی دەنگسازی» باس لێکراو بگەین؟

لە بارەی «ڕەسەنیەتی ڕیزمان» یشەوە دەبێ وەک یەک بوونی دەستوورەکانی ئێساتەکە و کۆنینەی هەزاران ساڵەی ئاخاوتنی کوردی بە ئیسپات بگات ئنجا بوێرین دەم لەو ڕەسەنایەتییە بدەین بەو جۆرەی کە گوتارەکە کە هەر بە ڕێوە لێی دەبێتەوە. تا ئێسا هیچ زانایەک و نووسەرێک و مێژووانێک لەوەی نەکۆڵیوەتەوە ئایا زمانی میللەتی «خوری – هوری» کە بۆ ماوەی هەزاران ساڵ بەر لە میلاد دانیشتوی هەموو کوردستانی سەروو و بەشی هەرە زۆری کوردستانی عێراق بووە چ تاوێکی بۆ سەر زمانی کوردی هێناوە؟ کە زمانەکەیان توایەوە چ خەڵتەییێکی نیشتە ناو زمانی کوردی؟ تۆ بڵێی خوریەکان شادەمارێکی «غەیری ئێرانی» لە میللەتی کورد پێک نەهێنن؟ ئەوەی ترانسلیتەرێشنی تێکستە خوریەکانی «گردی شمشارە» ی خوارووی ڕانیە بخوێنێتەوە دەتوانێ تروسکەی ئەو زمانە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا بدۆزێتەوە. ئەو تێکستانە بۆ نزیکی چوار هەزار ساڵ تێهەڵدەکشن، جا ئەگەر پێوەندیی زمانی خوریمان بە کوردییەوە سەپاند ئایا مەبەستمان لە «ڕەسەنیەتی ڕێزمان» ی کوردی چی دەبێ؟ پشتگوێ خستن و تێنەخوێندنەوەی ئەم تێبینیانە هۆی شانازی بە دەست کەسەوە نادەن، بایەخ پێدانیشیان پایەی زانایی کەس دانالەنگێنیت، بە ئیسپات گەیاندنی ڕەسەنایەتیی و نارەسەنایەتییش کاری بادی هەوا نییە، خۆ ئەگەر گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» پابەندی بەندی خۆی بکەم ڕێم هەیە لێی داوا بکەم، پێش ئەوەی هەنگاوی «ئیتیمۆلۆجی» کوردی بەرەو دۆزینەوەی وشەی بێگانەوە ببات

پێویستە وشە ڕەسەنەکانیان بەرەو سەرچاوەی ڕاستەقینەی خۆیانەوە ببات ئیتر لەوانەیە مەعلووم بکرێ کەوا بەشێکی وشەکانمان بە شیوەییێکی ڕەسەن لە سەرچاوەی غەیری ئێرانییەوە هەڵقوڵیون...

لەو ستوونە یەکەمەی لاپەڕە 19 دا وشەی «بەرامبەر» هاتوە. ڕاستی ئەم وشەیە «بەرانبەر» ە کە لە کێش و لە ڕیژەی «سەرانسەر» ە. هاتنی «ن» ی وەستاو لە پێش «ب» ـەوە لە ئاخاوتندا دەیکات بە «م» هەر وەک وشەی «عەنبەر» بە «عەمبەر» دەخوێندریتەوە بەڵام دەبێ «عەنبەر» بنووسریێت. من بۆ خۆشم بە هەڵە وەیا بە لەبیرچوون وا بووە «بەرامبەر» م نووسیووە. وشەی «دەوراندەور» یش یەکێکە لە تاقمی «سەرانسەر» و «بەرانبەر»...

هەر لەو ستوونەدا «گۆ کردن» بە واتای «تلفظ» بەکار هێنراوە. ئەمەشیان هەڵەیە چونکە بە واتای «جووڵە کردن» دێت وەک کە دەگوترێ «دەستی گۆ ناکات، زمانی گۆ ناکات». دیارە زمان گۆ کردنەکە بۆتە هۆی ئەو هەڵەیە.

دیسان لەو ستوونەدا هەڵەیێکی فکر هەیە. گوتارەکە لەو شوێنەدا وەها ڕادەنوێنێ کە قەرز کردنی وشەی بێگانە بۆتە هۆی پەیدا بوونی شێوەی هەمە جۆر لە زمانی کوردید. هەڵبەت ئەم ڕایە ڕاست نییە چونکە جودایی نێوان شێوە ئاخاوتنەکان لە وشە و عیبارەتی کوردیش بەدەر دەداتەوە چ لە ڕووی «تلفظ» ـەوە بێت و چ لە ڕووی دارشتنەوە بێت. بە نموونە، پشدەری دەڵێن «ئەمە گوتن» لە جیاتی «ئێمە وتمان» ی سلێمانی و «مە گوت» ی بادینانی دیارە ئەمانەش هیچیان لە دەرەوە بە قەرز وەرنەگیراون. لە حەقیقەتدا قسە لە بارەی هۆی پەیدا بوونی زاری جودا لە زماندا درێژەی هەیە و لێرەدا نە لێی دەبینەوە نە پێویستیشمان پێی هەیە، بەڵام لەم شوێنەی هەمان ستووندا کە دەخوێنیتەوە «...چونکە کەرەسە قەرز کراوەکە لە لایەکەوە، لە ڕەگەزێکەوە نییە» چاوەنۆڕی «لایەکی دیکەش» دەکەیت کەچی دەستت بە هیچ ناگات.

سەیری دارشتنەکەش بکەیت دەبینی بە دوا یەکدیدا هاتنی «...لە لایەکەوە، لە ڕەگەزێکەوە» یەکجار ناقۆڵایە و چ خزمایەتیی لەگەڵ شێوە نووسینی ئەدەبی نییە.

هەر لە بەرودوای ئەو ستوونەدا وشەی «تیادا» هاتوە. دەزانین «تیا» بریتییە لە «تێدا» کە بە هۆی سوانی «د» ەکە لە زاری سلێمانیدا بۆتە «تیا». لەبەر ئەمە «تیادا» بریتییە «تێدادا». هەر بەو پێیەش کە دەنووسرێ «تیایا» لە حەقیقەتدا دەبێ لە «تێدایدا» وە هاتبێت چونکە «تیا» وەک گوتمان «تێدا» یە «یا» کەی دوەمیش «یدا» یە. جا ئەگەر بمانەوێ زمانێکی ئەدەبی ڕاستمان هەبێت پێویستە بنووسین «تێدا» لە بری «تیا» بشنووسین «تێیدا» لە بری «تیایا»، دیارە «تیادا» ش بە هەموو مەزهەبان هەر هەڵەیە. خۆ ئەگەر نووسەرانی «تیا، تیایا، تیادا» بەردەوام بن لەسەر ڕاڕەوی خۆیان ناشێ داوا بکەن نووسەرانی دیکە واز لە کوردییە ڕەسەنەکە بهێنن با ناوی یەکچوون کردنی شێوەی نووسینی ئەدەبی، چونکە داوا لە شێوەی ئەدەبی دەکرێ کام ڕێباز ڕاست و دروستە ئەویان بکاتە شەقامەڕێی نووسین[2].

لە ستوونی دوەمی لاپەڕە 19 ی گۆڤارەکەدا وشەی «جوگرافیی» هاتوە، ڕێژەی نیسبەتی کوردی لە وشەی «جوگرافیا» دەبێتە «جوگرافیایی»
نەک «جوگرافی» چونکە ئەمەیان لە عەرەبییەوە وەرگیراوە. بەوەش لە عەرەبیەتی ناکەوێ کە «غ» ـەکە کراوە بە «گ» هەروەک کە لە

[2] - تەماشای گوتاری «ڕێنووسی کوردی — پەراوێز لە ل241 — 249 لە بەرگی چوارەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، 1976 و گوتاری «هەڵدانەوەی چەند ڕووپەڕەیێکی زمانی کوردی لە ل 274 — 300 لە بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، 1977 بکە.

جیاتی «بەسرایی» گوتت «بەسری» هەر ڕێژەی عەرەبیت بەکارهێناوە هەرچەند سینەکەشت لە جێی صاد داناوە.

هەر لە بەراوردی ئەو ستوونەدا تا سێیەکێکی ستوونی سێیەم ڕایەک دەربڕاوە لەبارەی پێویست بوونی بەکارهێنانی شیوەی ئەدەبی و بەلاوە نانی شێوە ئاخاوتنی ناوچەیی لە نووسیندا. هەڵبەت من پتر لەو نووسینە داواکاری چەسپاندنی شێوەی ئەدەبی زمانی کوردیم، وا دەزانم قوڵتریش بۆ ئەو مەبەستە ڕۆیشتوم، بەڵگەشم ئەو دوو گوتارەیە کە لە بەرگی چوارەم و بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا بڵاوکرانەوە و لێرەدا بە پەراوێز پەنجەیان بۆ ڕاکێشراوە. من لە ڕووی پەرۆشەوە بۆ زمانەکەمان، دەمەوێ نووسەری کورد ڕێگە بدات بە پەسەندترین و ڕەسەنترین و بەهێز و پێزترین تەعبیر و دارِشتن و شێوازی کوردی کە شێوە ئەدەبیەکەمان دەوڵەمەندتر بکات و بەرەو پێشتری ببات، ئەم ئامانجەش بەو تەرزە قسە سافیلکانەی ناو ئەو ستوونە پێک نایەت. هەر ئێستا نموونەیەکی ڕێنیشاندەری ئەو کارە دەخەمە بەر چاوی خوێنەر.

لە نێوان بەشێکی ئێلەکانی کورددا (وەک دانیشتوانی پشدەر – پژدەر) لە جیاتی «ئێمە کردمان، ئێمە گوتمان...» دەڵێن «ئەمە کردن، ئەمە گوتن» لە جیاتی «ئێوە کردتان، ئێوە گوتتان...» یش دەڵێن «ئەوە کردو، ئەوە گوتو...». لە حاڵێکدا بیانەوێ تەئکید بهاوێنە سەر دەوری شەخس لە کردەوەدا دارِشتنێکی تایبەتیی بەکاردەهێنن و دەڵێن «ئەمەن کرد، ئەمەن گوت – ئەوەو کرد، ئەوەو گوت» جا کە بیستت گوتیان «ئەمەن کرد» دەبێ بزانی مەبەستیان ئەوەیە گرنگی بدەن بە دەوری خۆیان لەو کردنەدا نەک بە کردنەکە خۆی، واتە لەو کردنەدا کەسێکی دیکە بێ لە خۆیان بەشداری کارەکە نەبووە. ئنجا سەرنج بگرە، لەم تەعبیرەدا «ئەمەن کرد و ئەوەو خوارد» ڕێت نییە ڕاناوەکان بقرتێنیت وەک کە لە ئاخاوتنی عادەتیدا ئەو ڕێیە هەیە. تۆ دەتوانی بڵێیت «کردمان، خواردتان – کردن، خواردوو» هەروەک

دەتوانی بڵێیت «ئێمە کردمان، ئێوە خواردتان – ئەمە کردن، ئەوە خواردوو» بەڵام کە هاتی لە ڕستەی «ئەمە کردن» دا ڕاناوە نەلکاوەکەی «ئەمە» وەیا لکاوەکەی «ن» ت قرتاند ڕستەکە واتا نادات. «ئەمە کردن، ن کردن» خۆ ئەگەر سەرلەبەری «ئەمەن» ت لە ڕستەکە ستاندەوە تاکە وشەیێکی ناتەواوی «کرد» دەمێنێتەوە. لەم نموونەیەدا مەبەستم ڕاکێشانی سەرنجی ڕۆشنبیری «دڵسۆز» ی کوردە بۆ ئەو جۆرە تەعبیرە ڕەسەنە کوردییانەی کە نەکوتونەتە ناو شێوازی ئەدەبیمانەوە، هۆی ئەم دیاردەیەش مەیلەو ڕوون کراوەتەوە لەو دوو گوتارەدا، کەسێک بیەوێ پتر لە باسەکە ورد بێتەوە دەتوانێ بۆیان بگەڕێتەوە و لە لای خۆشیەوە قووڵتر داگرێت لە ناوکێڵ کردنی دێراوەکانی نووسینی ئەدەبیمان.

لە بەراوردی ستوونی سێیەمی لاپەڕە 19 دا دەخوێنیتەوە: «...جا، هەر لەبەر ئەوەیە بۆیە دەستی هاریکاریەتیی...». لەم چەند وشەیەدا دوو هەڵەی گەورە هەیە. یەکێکیان ئەوەیە کە دەڵێ «لەبەر ئەوەیە بۆیە...» هەردوکیشیان یەک واتا دەبەخشن، دەستیش نادەن یەکدی تەئکید بکەنەوە چونکە تەئکید جێی خۆی هەیە و ئێرە هەو نییە... ئەم هەڵەیەیان ئینشائییە، هەڵەی
دوەم «صرفی» یە کە دەڵێ «هاریکارییەتیی» چونکە وشەی «هاریکاری» بە تەنها خۆی ئیسمی مەعنەوییە بە واتای «تعاون، تضامن...» وشەکەش بە هۆی پاشگری «ی» پەیدا بووە کە یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیسمی مەعنەوی وەک کە لە وشەکانی «جوانی، درێژی، کورتی...» دا واتای «جمال، طول، قصر...» ی دروست کردوە. لەبەر ئەمە بەسەرەوەنانی «ەتیی» دەبێتە لێ زیاد کردنی بێ سوود و هەڵەی «صرفی». جا ئەگەر نەخوێندوویەک وەیا تازە خوێندوویەک هەڵەی وەهای کرد ناشێ ئەدیبەکانمان بیکەنە بەڵگەی ڕاستبوونی ئەو کارە و بیسەپێنن بەسەر شێوازی ئەدەبیماندا. لە کۆنەوە گوتراوە «لەسەر بەردی سەنگی سەخرێ...» بەڵام ئەگەر لە قالوبەلایشەوە گوترابێ هەر کوتانەوەیەکی سێ جارەی بێلزومی یەک شتە... ئەم هەڵەیەی

وەک «خزمایەتی، کوردایەتی، برسیەتی...». وشەی «خزم، کورد» بەهۆی «ایەتی» بوونەتە ناوی مەعنەوی، وشەی «برسیی» ش بەهۆی «ەتی» یەوە. درێژەی ئەم باسە لە گوتاری «بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا» لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی 1973 دا بڵاوکراوەتەوە... بەهەمەحاڵ وشەی «هاریکارییەتی» وەک ئەوەیە بڵێی «برسییەتی یەتی»، جا ئەگەر کەسێک لە نووسیندا بەکاری هێنابێت هەڵەیەکی کردوە، وەک کە هەموومان بە هەڵەدا دەچین، هەڵەش لەسەر مرۆڤ بە عەیب حیساب ناکرێ ئەگەر دوای ڕوون بوونەوەی خۆی پێوە نەلکێنێت...

دوای دوو دێڕی کورتیلە تووشی ئەم شتە دێیت «...زانایانی کورد و کوردەوانییەکان زماناناسەکان بۆ هێنانە دیی...». ئەم ڕیز کردنە نە واتا دەبەخشێت و نە تۆسقاڵێکیش جوانیی تێدایە و نە بە هیچ بۆرە تەئویلانیش بۆ لای نووسینی ئەدەبی دەچێتەوە. من لە لای خۆمەوە یارمەتییەکی ناتەواوی ڕستەکە دەدەم بەوەدا کە بڵێم واوێکی عەتف لە نێوان «کوردەوانییەکان زماناناسەکان» پەڕیوە، بەڵام چاری «کوردەوانییەکان» نە بە من دەکرێ نە بە کەسی دیکەش، چونکە ئەم وشەیە ناوی مەعنەوییە لە «کوردەوان» ەوە هاتووە وەک کە «پاسەوانی» لە «پاسەوان» ەوە هاتوە، بەوەش لە ناوی مەعنەوی ناشۆرێ کە بەهۆی «کان» ەوە خراوەتە ڕێژەی کۆ هەر وەک «پاسەوانییەکان» لێی ناشۆرێ. بەو پێیە ئەگەر وشەکان وەرگێڕینە سەر عەرەبی وەها دەردەچن «علماء الكرد والكرديات وعلماء اللغة...». دیارە گوتارەکە لەم ئیزافەیەی ناوی مەعنەویی بۆ سەر ناوی مادیی و بەدوادا هێنانی ناوێکی مادی دیکە بۆ پاش ناوە مەعنەوییەکە وای تصور کردوە کە «کوردەوانییەکان» یش هەر ناوی مادییە، واتە بە خەیاڵی «کوردەوان» وشەکەی بەکارهێناوە، بەڵام لەمەشدا دووچاری هەڵە بووە چونکە ئەوسا وشەکە وەک «بەرخەوان، کارەوان» ی لێ دێت کە خەریکی پەروەردە کردنی

بەرخ و کارە، «کوردەوان» یش دەبێ خەریکی مرۆڤی کورد بێت بۆ بەڕێوەبردن و پەروەردە کردنی کە ئەمەش ناشێ مەبەستی گوتارەکە بێت. دیارە ئەوەی کە مەبەستە لەم وشەیەدا واتای «المهتمون بالكرديات» ە. جا کە ئەمە وابێ پێویستە لە وشەی «کوردی» یەوە بۆی بچین و بڵێین «کوردییەوانەکان» کە بە ڕینووسی ناو گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ دەبێتە «کوردی یەوانەکان».

لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە 20 ی گۆڤارەکەدا ئەم عیبارەتە هاتووە «... بۆ ژیاندنەوەی کەلەپوری کوردیی و سەرفراز کردنی لە دەست زەبر و جەوری تۆز و خۆڵ و ئاڵوگۆڕی چەرخ...». لە ئاست وشەی «سەرفراز کردن» دا هەر ئەوە دەڵێم، لێرەدا بە شێوەی ئاخاوتنی عادەتیی نەک ئەدەبیی بەکار هاتوە چونکە ناشێ بڵێین کەلەپوور سەرفراز دەکەین مەبەستیش پاراستنیەتی.

باوەڕ ناکەم لێرە بە پێشەوە کەس نووسیبێتی «زەبر و جەوری تۆز و خۆڵ...» چونکە زەبر لە کوتەک و گاشەبەردەوە چاوەنۆڕی دەکرێت نەک لە تۆز و خۆڵ. ئەم بەکارهێنانە هەڵەیەی «زەبری تۆز و خۆڵ» لە هیچ شێوەیێکدا دروست نییە، نە ئەدەبیی و نە عادەتیی، پاراستنی کەلەپۆریش بۆ ئەوە نییە وشە پاراستراوەکان لە جێگەی نالەباردا بەکاربهێنرێن[3]. ئەدەب و خوێندن و ڕۆشنبیریش بۆ ئەوە نین نووسەران لە ڕێکاری عادەتی خەڵق بەرەژێر ببەن. وشەی «ئاڵوگۆڕ» یش لە ڕاستیدا بە واتای «بە یەکدی گۆڕینەوە، جێگە بە یەکدی گۆڕینەوە» دێت نەک «گۆڕین» ی ڕووت وەک کە لەم شوێنەدا بەکار هاتووە. دەبینم نووسەران ناوناوە ئەم وشەیە بە واتای «گۆڕین»

[3] لە هەندێ حاڵدا بۆ مەبەستی سووک دەربڕینی وشە دەنگێکی «د» دێتە ناو کلێشەی وشەوە وەک کە گوتم «بهێندرێن» وەیا کە دەگوترێ «بگۆڕدرێ، دەربڕدرێ».

بەکاردەهێنن، بەڵام، وەک دەزانین، هەڵە کردن نابێتە بنەمای دەستووری هیچ شتێک. کە دەڵێی «لە ژوورەکەمدا ئاڵوگۆڕم بە شوێنی کەلوپەلەکم کرد» مەبەستت ئەوەیە جێگۆڕکێت بەو کەلوپەلە کردوە واتە یەکێکیانت بردۆتە جێگەی یەکیکی دیکە، یاخود کە دەڵێی «من و دارا ئاڵوگۆڕمان بە گۆرەویەکان کرد» مەبەستت بەیەکدی گۆڕینەوەی گۆرەویەکانە دەنا گۆرەویەکان خۆیان لە خۆیاندا نەگۆڕاون... جگە لەم لایەن، لە لایەنی موناسەبەی واتای وشانیشەوە، چ خزمایەتیی پەیدا نابیَ لە نێوان «تۆز و خۆڵ لێنیشتن» و «ئاڵوگۆڕ» دا چونکە ئەو ئاڵوگۆڕە چ بە واتای گۆڕینی عادەتی بێت و چ بە واتای پێک گۆڕینەوە بێت تۆز لە شتان دەتەکێنێت نەک لێیان دەنیشێت. لەبەر ئەمە سەرلەبەری ڕستەکە بە هەموو کێشانە و پێوانەیێک هی نووسینی ئەدەبیی نییە، بە کەڵکی ئاخاوتنی سادەش نایەت.

بە دوا ئەمانەدا، توانجە بەستەزمانەکەی کە بە دەوری ناوی «محەمەد عەلی» یەوە بۆ گوتارەکە ڕێکخراوە و لە «پێشەکی» یەکانی من گیراوە بەجیَ دەهێڵم بۆ ئەو گوتارە و خوێنەرانیش. «پێشەکی» من و غەیری من باری کەوتوی یەکێکی دیکەی پیَ ڕاست نابێتەوە، تەنها تێبینیەکیشم هەبیَ لە ئاست ئەو توانجەدا ئەوەیە کە تالاَوی سەرلەبەری گوتارەکەی تێدا ئاشکرایە، ئاشکراییەکەشی لەوانەیە گومانی خوێنەران بۆ ئەوە ببات کە ڕێکخەرانی گوتارەکە تۆڵەی شتێکی لێرە بە پێشەوە وەربگرنەوە چونکە هەموومان ئەوەندە شارازاییەمان بە خۆمان هەیە کە بزانین ئەو تەرزە شێوازە ناحەزانەیە لە تاکە سەرچاوەی سۆز و پەرۆشەوە هەڵناستێت. دەردی یەکجار گرانی نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆژانەمان لەوەدایە کە بە ناوی مەوزوعیەت و پەرۆشەوە کام مەبەستی شەخسییە ئەویان بۆ ناو «بابەت» ڕاپێچ دەکریَ. بەهەمەحاڵ چەند و چۆنی ئەم لایەنە ناتوانیَ خۆی بهێنێتە ناو ئەوەی لێرەدا پێوەی خەریکم.

تا ئێرە گوتارەکە پێشەکیی بوو بۆ ڕەخنەگرتن لە نووسینەکانی من، وەک بۆشت دەردەکەوێ، پێشەکیەکە لەسەر هەموو بێهێزیی خۆیەوە هێشتان لە چاو زێدە هەژاریی ڕەخنەکان بایەخێک پەیدا دەکاتەوە.

ڕەخنەکان لە پێشەوە بەرەنگاری وشەی «حەشارگە» بوون و خێرا بە خێرا گۆڕیویانە بۆ «هەشارگە». وا بزانم بریقوباقی «هەوشار» فێڵی لە چاوە درشتبینەکانی ئەو گوتارە کردوە و ناوبانگی صەگی «هەوشار» ڕێی زەللەی لە پێش هەنگاوە بڵاوەکانیدا هەموار کردوە. ئیتر لەو پەلەپەلەی ڕەخنەگرتنی بێجیدا تەلەزگەی بەستوە بۆ هەڵدێری هەزاری بە هەزاری ئەوتۆ گورسیشی بۆ شۆڕ کەیتەوە سەرکەل نابێتەوە. مرۆڤ کە هێندەی ئەو شوێنەی گوتارەکە لە ڕاستیی و لە بەڵەدیی و لە ئینساف دوورکەوتەوە، بە کەس ناکرێ جاریکی دیکە ڕووی هەتڵەبوونی لە دروستیی و ڕوونبینی و شارەزایی بکاتەوە. بە نموونە دەڵێم، یەکێک کە پێی داگرت لەسەر ئەوەی قەڵادزە کەربەلایە هەرچی خەریتەی دنیا هەیە ناتوانێ باوەڕە سەرەوبنەکەی هەڵگێڕێتەوە.

وەک لە لاپەڕە 9 ی کتێبۆلکەی «چەند حەشارگە...» دا نووسیومە: «حەشارگە جێی خۆ تێدا شاردنەوە وەیا شت تێدا شاردنەوەیە». وشەی «حەشار» یش لەگەڵ فیعلە یاریدەرەکانی «بوون، کردن...» دا ناڕوات بەڵکوو تەنها فعلی «دان» بە خۆیەوە دەگرێت و دەگوترێ «خۆی حەشار دا، حەشارت دەدەم...». هەر لەم دوو ڕستەوەش[4] دەردەکەوێت کە مەرج نییە حەشارگە تەنها بۆ دڕندە بێت، تەنانەت ڕاوکەران بە زۆری بۆ بزنەکێوی و مەڕەکێوی بەکاری دەهێنن، بۆ بەرازیش زیاتر «لانە بەراز» ڕۆیشتوە هەرچەند مانیع نییە لەوەدا حەشارگەشی بۆ بەکار بێت چونکە ئاخاوتن

---

[4] دەگوترێ «لەم دوو ڕستەوەش» هەروەک دەشێ بگوترێ «لەم دوو ڕستەشەوە» بەڵام تەنها دەگوترێ «لە تۆشدا، لە کۆیەشڕا» ناگوترێ «لە تۆداش، لە کۆیەڕاش».

بەبەریەوە هەیە وشەیێکی «عام» بۆ واتای «خاص» بەکار بهێنێت، وەیا لانە بەرازەکە هەر خۆی حەشارگە بێت... لە ڕاستیشدا بەراز دڕندە نییە چونکە گیاخۆرە، بەڵام من شەڕ بە گوتارەکە نافرۆشم و بە دڕندە حیساب کردنی بەرازی لێ بەهەڵە ناگرم.

هەوشار ناوی ناوچەیەکی بەرینی کوردستانی ئێرانە و صەگەکەی پێ هەڵدەدرێتەوە، وەک کە لە پشدەردا دەڵێن صەگی «حەسار» مەبەستیان صەگێکە کە لە ڕەسەنی صەگی ئەو دێیەی «حەسار»[5] بێت.
ئەگەر «هەوشار» بە واتای «دڕندە» بێ دەبێ ڕێش هەبێ بڵێین «شێری هەوشار، گورگی هەوشار...». هەڵبەت شتی وەها لە کدولەی تەڕیشدا نەبیستراوە...

کە حاڵوباری «حەشارگە» ئەمە بێ چ جێی ئەو سەرسوڕانەی ناو گوتارەکەی تێدا نییە کە دێت و دەڵێ «نازانم بۆچی ئەم بەرهەمەی ئەم ناوەی پێوەنراوە». گوناهێکی کتێبۆلکەکە و من و «حەشارگە»ش لەوەدا نییە کە گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» لە مەسەلەکە نابەڵەدە، بێگومان «سەرنج ڕاکێشانی بازاڕ» یش لە خۆ نواندنی بێ بنج و بناواندایە. لە موکریان لەجیاتی «حەشار، حەشارگە» دوو وشەی «حاشار، حەشارگە» بەکار دەهێنن.

بە دوا ئەم سەهوە زلەی گوتارەکە لە وشە و واتای «حەشارگە» دا دەبینین بەڵێنی نرخاندنی ناوەڕۆکی کتێبۆلکەکە دراوە، کەچی ببڕای ببڕای گوتارەکە نزیکی باسەکانی «حەشارگە» نابێتەوە و خۆی لە چەند لایەنێکی تەعبیر و وشەکانی دەئاڵێنێ ئەویش وەک کە ئێستا ڕوون دەبێتەوە بە شێوەیێکی یەکجار

---

[5] وشەی «صەگ» بە پیتی صاد نووسرا هی «حەسار» یش بە پیتی سین چونکە خەڵقەکە وایان دەردەبڕن.

نابەڵەدانە. گوتارەکە پێمان ناڵێ ئەو پاشگرانەی باسیان لێ کراوە چین و چۆنن، ناوگر لە کوردییدا هەیە نییە، کۆتاییەکانی فیعلی ئایندەی کەسی سێیەمی تاک و دووەمی تاک ڕاناون ڕاناونین، فیعلی «انتقالی، پێچەوانە» هەڵدەگرن قسەیان لێوە بکرێ یاخود هەر دەبێ باسە کۆن بوەکانی ڕێزمان بکوتینەوە... من ئێستاش داوا لە خوێنەران دەکەم سەرنج بگرنە ئەم لیستەیە لە شیوەگۆڕی فیعلی کوردی لەو بارانەدا کە من ناوی «انتقالی» و «انتقالی پێچەوانە» م لێناون.

| فعلی عادەتی | شیوەی انتقالی | شیوەی انتقالی پێچەوانە |
|---|---|---|
| دەبم | دەبمێ | دەمبێ |
| دەچم | دەچمێ | دەمچێ |
| دەمەوێ | | |
| دەمدزێ | | |
| دەیەخەم | دەیەخمێ | |
| دەکەوم | دەکەومێ | دەمکەوێ |
| دەئێشێ (دێشێ) / دەیئێشێ (دەییەشێ) | | |

ئاخۆ بۆچی فیعلەکان هێندێکیان سێ شێوەیان هەیە هێندێکیشیان دوو شیوەیان هەیە، کەچی بەشێکیان هەر شێوەی پێچەوانەیان هەیە، خۆ ناشکرێ دیاردەکە لە دەفتەری زمانی کوردی بسرێتەوە هەر لەبەر ئەوەی پێشتر بیری لێ نەکراوەتەوە وەیا گوتاری وەک هینەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» ناتوانێ پێوەی خەریک بێت وەیا ئەو بەکارهێنانە لە گەڕەک و کۆچەی نووسەراندا باو نییە.

با بزانین گوتارەکە چۆن بە ناوەڕۆکی «حەشارگە» وە خەریک بووە. لە پێشەوە گوتارەکە چاوی هەڵبەزیوەتەوە لە بەکارهێنانی تەعبیری «شل کردنەوە» و وەهای لێ خێل و خوار بۆتەوە هەر دەڵێی کەوە و دیوجامەی دیتوە. شل کردنەوە بە عەکسی بۆچوونی گوتارەکە نە پێشەکییە و نە دەسپێشخەرییە و نە سەرەتاشە، چونکە وەک لە واتاکەیەوە دەردەکەوێ ئاسان کردنە. دەتەوێ دەرمانێک وەیا خۆراکێکی وشک بوویەوە بەکار بهێنیت، نەختەک ئاوی تێ دەکەیت و بە کەوچکێک وەیا دارۆچکەیێک وەیا بە پەنجەکانت تێکیان هەڵدەشێلیت و شتە ڕەق هەلاتۆکە شل دەکەیتەوە، منیش لەو ڕوپەڕانەی هەرەپێشەوەی «حەشارگە» کەدا ئەوەم کردوە. ئنجا ئەمەش لە بەیندا نەبێ، زمانی کوردییە و لە دەقی خۆی و بە ڕێبازێکی کوردانەدا لەگەڵ خۆمم هێناوە بۆ بەرچاوی خوێنەری کورد ئیتر بۆ دەبێ «نووسەرا!» ی کورد ئەو دڕدۆنگییەی لەگەڵدا بکات...

دوای ئەمە، گوتارەکە ڕەخنەی لە بەکارهێنانی وشەی «بەرچاو» گرتووە و دەڵێ «... چونکە هەرگیز کورد ناڵێ «بەرچاوەکان»، بەڵکو کورد دەڵێ «ئاشکراکان» یاخود «دیارییەکان» یاخود «ئەوانەی کە لە بەرچاون» ...». لێرەدا مەعلوم دەکرێ، ئەو کەسەی ڕەخنەکەی گرتووە لەوانەیە هەر گوێبیستی ئاخاوتنی کوچە و کۆلانی گەڕەکی شارەکەی خۆی بووە و فەرهەنگی وشەکانی قسە پێکردن و نووسینی زۆر هەژارە چونکە وشەی «بەرچاو» بەو واتایەی من لەو شوێنەدا بەکارم هێناوە هی ڕەخنە لی گرتن نییە مەگەر لەلایەن ئەو جۆرە بێخەبەرەی زمانی کوردییەوە بێت... کە دەڵێ «هەرگیز کورد ناڵێ...» وای لێ چاوەڕوان دەکرێ بەقەدەر هێزوپیزی وشەی «هەرگیز» ی وەها بڕندە شارەزای کوردی بێت کەچی، بە ڕاستی، خاوەنی ئەو «هەرگیز» ە مافی بە دەیەکی لەخۆ بایی بوونەکەی نییە. چەند جێی پەرۆشە نووسەری کورد لەو ناوەڕۆکانەی کە بەتەمایە لێیانەوە بدوێ هەڵبێت و بە تەپکەیێکی وەها بچکۆلانەی «بەرچاو و ئاشکرا» وە بێت.

وشەی بەرچاو لەو جێگەیەدا کە من بەکارم هێناوە لە ئاشکرا و دیار بەهێزتر و ڕاگەیێنترە چونکە لەوانەیە چاو بەسەر شتی ئاشکرادا بکشێت و فەرقی پێ نەکات بەڵام لە نەدیتنی شتی «بەرچاو» چ عوزری بە دەستەوە نامێنێ، تۆ سەیرێکی نووسینەکەی من بکە چۆن دەڵێم «نووسینەکەم ڕوو لەو ڕێزمان شناسانەش ناکات کە ڕاهاتووی باسە بەرچاو و ناودەرکردوەکانی ڕێزمانن...». هەقم هەیە لە خوێنەری کورد داوا بکەم لەو تەعبیرە سادە و بێ قورتەم بگات، لەوەش وردبێتەوە کەوا من هەقی وشەی «بەرچاو» یشم پڕ بە پێستی واتاکەی داوە کە لەگەڵ «ناو دەرکردو» ی جوت دەهێنم نەک ئاشکرا و دیار، چونکە ناودەرکردووش وەک بەرچاو هی لێ بێ ئاگا بوون نییە. ڕەخنە گرتن کارەکی پڕ سوودە، بەڵام دەبێ ڕەخنەگر گەییشتبێتە پلەیێک بەسەر بابەتی ڕەخنە لێگیراودا بنوارێت نەک لە نزمایییەوە ڕەخنە لەو شتانە بگرێت کە بەسەریاندا ڕاناشکێت. دەبینیت، گوتارەکە تا ئێستا حوکمی بەکارنەهێنانی بەسەر دوو وشەی ڕێکوپیک و ڕاست و ڕەوانی «حەشارگە» و «بەرچاو» دا دەر کرد، شل کردنەوەشی تاوانبار کردبوو، هەر بزانە «دەستوورات» یشی لێ مەنع کردین، بڕوا دەکەم ئەم گوتارە ئەگەر دەسەڵاتی تەواوی هەبێ خواردنی «چەنگ سۆتەکە و پەلەپفە» ش لە عالەم مەنع دەکات بەوەدا کە بڵێ هەرگیز کورد خواردنی وەهای نەخواردوە...

وشەی «دەستوورات» یش وا دیارە بەلای نووسەرانی[6] گوتارەکەوە عەنتیکە بێت. من لێیان بە عەیب ناگرم نەیانبیستبێت، بەڵام لێیان ناوەشێتەوە بە پەلە بڕیاری نەبوونی بدەن.

---

[6] گوتارەکە هاواریەتی، پتر لە یەکێک تێیدا بەشدار بوە. ئەوەی ڕاستیش بێ، بەر لەوەی من بیبینم هەبوون دەیانگوت شیوازەکەی جۆرە گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە لە چاو جارانی... کە خوێندمەوە منیش هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە وا یارمەتی دراوە، بەڵام لەلایەن دەست و قەڵەمێکی شلکەوە.

له کوردیدا ڕێژەی کۆ «واتە: صیغة الجمع» وەک دەزانین چەند شێوەیێکی هەیە، هی لە هەموویان مەشوورتر و شایعتر ئەوەی بە لێ زیاد کردنی «ان» پەیدا دەبێت وەک: ژنان، پیاوان...

ڕێژەیەکی تایبەتی کوردی هەیە بۆ «کۆ» کردن لە کاتی بانگ کردندا وەک کە دەڵێن: کوڕینە، خەڵقینە، مامۆستاینە...

ڕێژەیەکی یەکجار دەگمەنیش هەیە وەک: میوەجات. لە فارسیدا «حاصلجات، عملجات...» ڕۆیشتوە. دەتوانین وشەی وەک: «خوردەوات، سەبزەوات» یش لەم جۆرە وەیا لە جۆری دواتر حیساب بکەین.

ڕێژەی چوارەم ئەوەیە بە خستنە سەری «ات» پێک دێت، وەک، دێهات، ماڵات، باغات. ئەم ڕێژەیە، بە ڕێکەوت، نالی لە شیعرە کوردی – عەرەبیە ئامێزەکەی «درونی لدار الشهرزور وبرودە» بەکاری هێناوە: فغابات داغات جرگ الشقایق.

وشەی «دەستوورات» لەوانەیە بەر ئەم ڕێژەیە کەوتون، بە زۆریش لە نێوان کوردەواریی دەشتودەردا بەکار دێت وەک کە دەڵێن: دەستووراتی فەلاحەت. جا ئەگەر ئەدیبێک و نووسەرێک و کوردێکی عادەتی نەیبیستبێت خەتای من و زمانی کوردی لەوەدا نییە. وەک دەبینیت نەگەڕان بە وڵاتدا چەند کار دەکاتە زمانناسیی...

بە دوا دەستووراتدا گوتارەکە ڕەخنەیەکی قورس و نارەوای لە عیبارەتێکی ناو «حەشارگە» گرتوە هیچیشی بەسەر هیچەوە نییە. گۆیا من لە لاپەڕە چواری کتێبۆلکەکەدا گوتومە «...لایەنە یەکجار بزر و وردەکانی بچکۆلە نارێک و پێچەکانی ڕێزمان...». ئەم ڕاگوێستنە لە نووسینەکەی منەوە بۆ ناو گوتارەکە

هەڵەی گەورەی تێدا کراوە، هەر دەشڵێی بە ئانقەست چونکە هەڵەی چاپ سنووری هەیە...

من لەو لاپەڕەیەدا ئەمەم نووسیوە «بەڵێ بێگومان زەحمەتیی کاروباری زمان هەر لە دەربڕینی دەنگەکانی ئاخاوتنەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە کۆتایی زەحمەتە زۆر ئەستەمەکانی لایەنە یەکجار بزر و وردەکانی ڕێچکۆڵە تاریک و پێچەکانی ڕێزمان». بە ڕاستی، من کە ئەم داڕشتنەم پەسەند کرد، ئێستاش پەسەند تری دەکەم، دوو ئامانجم دەرنەزەر کردبوو. یەکەمیان دەرخستنی گرنگیی و قوڵایی باسەکان، دووەمیشیان حورمەت گرتنی خوێنەری کورد لە ڕێی دواندنی بە تەعبیری ئەدیبانە و شارەزایانە. تۆ سەرنج بدە
واتای «زەحمەتی زۆر ئەستەمی لایەنی یەکجار بزر و وردی ڕێچکۆڵەی تاریک و پێچەک». وا بزانم ئەگەر غەدری لێ نەکرێ، ئەم تەعبیرە هی ڕەخنە لێ گرتن نییە. تۆ لە لای خۆتەوە بە عیبارەتێکی وەک «سەرەڕای ئەوەش کەچی هێشتا ئاوێستا، ئێستە هەر بە زمانێکی مردوو...» ی ناو گوتارەکەی بگرە و پێم بڵێ ئایا گوتارێک خەریکی ئەو «هەدار هەدارانێ» یە بێت مافی ڕەخنەگرتنی دەمێنێت؟ کەسێک بیەوێ ڕاستی شتان تێبگات، دەزانێ من لە نووسینمدا، چ عەرەبی، چ کوردی، دەمەوێ بە پێی دەسەڵات مافی تەواوی زمان بدەم بە نووسینەکە چونکە «تەعبیر» و شێواز بەشێکی بنجییە لە بەرهەمی ئەدەبی، لێرە بە پێشەوەش گوتومە شێواز و ناوەڕۆک لە یەکدی جودا ناکرێنەوە چونکە «شێواز نماکردنی ناوەڕۆکە بەرەو دەرەوە...» خۆ بە زمانی خۆشم نەڵێم، ئەوەندە بەبەر نووسینی منەوە هەیە کە نووسینێکی وەک ئەو گوتارە پتر هەڵوەست لە ئاستیدا بکات و درەنگتر بەربێتە گیانی و شارەزایانەتر خۆی لێ بە سەهوو ببات. کە ئەمە بۆ خۆم داوا دەکەم بۆ هەموو کەس و لە هەموو کەسی داوا دەکەم... خولاسە!!

ئنجا نۆرەی وشەی «حیسابان» ـە.

گوتارەکە لێی بە عەیب گرتوم کە گوتومە «خوێندەواری عادەتیشم لە حیسابان دەرهاویشتوە...» لەوەدا گۆیا وشەی «حیسابان» هی کوێرەدێیەکە... بەڵام نووسەرانی گوتارەکە لە خۆیان کەوتونەتە گومانەوە نەکا وشەکە هەر بەکارهێنانی تاکە یەک کوێرەدێ نەبێت ئیتر بە خێری خۆیان ئەمەشیان هاویشتۆتە سەر کوێرەدیکەوە «ئەگەر زۆر بەرفراوانیش بەکار هاتبێ هەرگیز لە ناوچەیەکی بچکۆلە زیاتر تەجاوەز ناکا...» من نووسەرانی گوتارەکە سەغڵەت ناکام بەوەدا لێیان بپرسم، کام کوێرەدێ؟ کام ناوچە؟ هەقمیشە لێیان بپرسم چونکە دیسان وشە پفدراوەکەی «هەرگیز» یان بەکارهێناوە.

لەگەڵ ئەمەشدا کە گوتارەکە لێرەدا بایی فەرقی نێوان شەو و ڕۆژان «ببینە دەڵێم ڕۆژان — نەک ڕۆژ» لە جەوهەری زمانی کوردی دوور کەوتۆتەوە، هەر سپاسی دەکەم چونکە خێرایی پێ کردم لە ڕەواندنەوەی تاریکایی بە دەوری یەکیک لە خاسیەتە بنجییەکانی تەعبیری کوردی کە تا ئێستا قسەی لێوە نەکراوە، خۆشم دەرفەتم نەبوە ڕوونی بکەمەوە، هەر بەو نیازەش کە لەگەڵ ئەندامانی «لیژنەی زمان و زانستەکانی» کاتێ گەیشتینە باسی «سینتاکس» لێی بکۆڵینەوە، بەڵێ بەو نیازە خۆم لە باسەکە دەدزیەوە بۆ فەرمانی پێویستتر، بەڵام وا، خوا و ڕاستان، لە سایەی ئەو گوتارە هەلی ساغ کردنەوەی بەکارهێنانی ڕێژەی کۆ لە ڕاستە ئاخاوتنی کوردیدا هەڵکەوت و منیش بە چاکەی زمانی کوردی و بۆ سوودی ئەوانەی وەک نووسەرانی ئەو گوتارە لە باسەکە بەسەهوو چوون لە سەری دەنووسم.

یەکیک گوێبیستی شێوە جۆرجۆرەکانی ئاخاوتنی کوردی بووبێت، وەیا هەر نەبێ سەرنجی لە ناوی بەشێکی زۆری ئاواییەکانی کوردەواریی گرتبێت، هەست بە دیاردەی «ئاشقەکۆ» یی دەکات، واتە لە کوردیدا گەلێک جار ڕێژەی کۆ بەسەر ڕێژەی تاکدا تەرجیح دەدرێت. بێگومان ئەو تەرجیح دانە لە خۆوە و بێ مەبەست و بی سوودی «بلاغة» نییە، واتە کارێکی بێ لزوم و بێ جێ نییە چونکە هەرجارە لەو ڕێژە کۆیانەدا مەبەستێکی تایبەتی ئاخێوەر

جێبەجێ دەکرێ. بەلای باوەڕی منەوە لە بنەڕەتدا ئەم بەکارهێنانەی ڕێژەی کۆ بۆ «بە گەورەترین» و «تغلیب» سەری هەڵداوە، دیاردەکەش بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە:

1- ناوی زۆر ئاوایی کورد بە «ان» ی کۆ کۆتایی دێت. وەک: خدران، حاجی ئۆمەران، قەڵاچوالان، پشت ئاشان، سەرسییان، ئاودەلۆکان، سەرکەپکان، باسموسیان، کاولۆکان... مەیلی بەکارهێنانی ڕێژەی کۆ لەم ناوانە بە تێکڕایی و لە سێ ناوی «خدران، حاجی ئۆمەران، ئاودەلۆکان» بە تایبەتی زۆر ئاشکرایە، هەڵبەت ناوی دیکەی وەک ئەمانەش لە زۆر زۆرترە.

2- مەیلی بەکارهێنانی ئەم ڕێژەیە وا دەکات ئاخێوەری کورد لە بەدوا یەکتردا هاتنی دوو ناویش «ان» یک بخاتە کۆتاییانەوە وەک کە دەڵێن «خدر و مرادان توتنەکەیان داشت — فاتم و هەمینان مەڕەکە دەدۆشن...». گوێم لێ بوە گوتراوە «بەیتی مەم و زینان»، «مەکە و مەدینان...». هەر بە دوا ئەمانەشدا «بانگی شێوان...»، «بانگی خەفتنان...».

3- وا دەبێ بە نیازی ڕێز لێنان لە حاڵەتی «اضافة» شدا کە هیچ واتای کۆی تێدا نییە «ان» ـەکە بەکار دێت وەک کە دەڵێن «عەوڵای عومبەران — مەبەست «عبدالله بن عمر» ە - برایمی مەلا زێندینان..».

پێویستە لێرەدا لایەنێکی دیکەی ئەم دیاردەیەش ڕوون بکەمەوە چونکە وا پێ دەچێ سەرلەبەری دیاردەکە بەلای ئەو گوتارەوە لە تاریکاییدایە.

ئاخێوەری کورد مەیلی بۆ ئەوە دەڕوات کە وا لە دوو حاڵەتی «اعرابی» دا وشە بخاتە سەر ڕێژەی کۆ، دیارە کە دەشڵێم «اعرابی» مەبەستم لایەنی بەلاغی نییە.

حاڵەتی یەکەم ئەوەیە کە وشە «مفعول» وەیا وەک مەفعول وا بێت، هەرچەند ئەم ڕاستییەش مەنعی ڕێژەی کۆ لە حاڵەتی «فاعلية و مبتدأ و خبر» ناکات. لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم بە زۆری لە «مفعولية» دا وشەکان پتر بەلای ڕێژەی کۆوە دەبردرێن. بە نموونە:

دەگوترێ «بە دیناران خۆی ڕزگار کرد...» لێرەدا «دیناران» لە ژێر تاوی پریپۆزیشن «حرف جر» دایە. کە «دینار» ەکە بکەیتە «فاعل» بە عادەت دەڵێی «دینار ڕزگاری کرد وەیا ڕزگاریان کرد- ناڵێی دیناران ڕزگاریان کرد». وشەی دینار لەم ڕستەیەی دواییدا «دینار ڕزگاریان کرد...» هەڵدەگرێ وەک کۆ مامڵەتی لەگەڵدا بکرێ لەو ڕووەوە کە مەبەست جنسی دینارە و لە واتادا کۆمەڵە دینار دەگرێتەوە، دەشکرێ مامڵەتی تاکی لەگەڵدا بکرێ چونکە وشەکە بۆ تاکە.

لە حەیراندا ئەمە دەبیەیت: کیژ دەڵێ چ عەیبم نینە و چ عەیبانم لێ مەگرن.

سەرنج بدە وشەی «عەیب» کە لە پێشەوە وەک «مبتدأ» هاتوە ڕواڵەتی وشەکە تاکە و نەگوترا «عەیبانم نییە» بەڵام چونکە مەبەست لە
وشەکە «مطلق» ی عەیبە «خبر» ەکەی خراوەتە ڕێژەی کۆ و گوترا «نینە» نەگوترا «نییە». بەڵام جاری دوەم وشەی «عەیبان» چونکە لە
حاڵەتی «مفعولية» دایە ڕێژەی کۆی بۆ بەکارهێنرا. ئەم مامڵەت جودایەی حەیرانەی کوردی لەگەڵ وشەی «عەیب» دا کردوەتی دەکەوێتە بەر حوکمی ئەو دەستوورەی «کۆ کردن» ی مەفعول و «تاک هێشتنەوە» ی فاعیل و «مبتدأ»، بەڵام لە گوتارەکەی «کوردواتەنی» دا مامڵەتێکی ئەوتۆیی کراوە هەتا بڵێی دورە لە دروستی. لە ستوونی سێیەمی گوتارەکەدا «هەن و نییە» بەکار هاتوە لەمەشدا «هەن» بۆ کۆیە و «نییە» بۆ تاکە بێ ئەوەی هیچ هۆیەکی ئەو مامڵەت جوداییە هەبێ لە ڕستەکەدا یا لە خودی وشەکاندا. یا دەبێ بگوترێ «هەیە و نییە» یاخود «هەنە و نینە».

حاڵەتی دووەم ئەوەیە کە ئاخێوەری کورد پتر حەز بە کۆ کردنی مەفعول لە ڕێژەی ئایندە «مضارع» دا دەکات نەک ڕابردوو و ئێستاکە (مەبەست لە ئێستاکە ئەو ڕستانەن کە فیعلی ئاشکرایان تێدا نییە وەک، من دارام، تۆ منالیت، ئێمە بەقالین...). بە نموونە، خەڵک بە ڕاشکاوی دەڵێن، مامزان ڕاو دەکەم، شوتییان دەشکێنم، خانوان دەڕمێنم...» لە بەیتی فۆلکلۆری گاڵتەئامێز گوتراوە: «حەیران وەرە لەسەری سەفینی، چاوەکی کۆرە، ئێکی نابینی، دەست لۆ هەناران دەبا هەنجیران دەپچڕێنیٚ». وشەی «هەناران» کەوتۆتە ژێر تاوی «لۆ» ی پریپۆزیشن و فیعلەکەی «دەبا» ش کە کاری تیٚ دەکا ڕێژەی ئایندەیە، دیارە وشەی «هەنجیران» یش مەفعولی فیعلی «دەپچڕێنیٚ» یە کە لە ڕێژەی ئایندەدایە. ئەم خۆشجڵەوییەی «مفعولیة» بۆ ڕێژەی ئایندە لە ڕابردودا دەرناکەویٚ. بە ڕاشکاوی ناگوتریٚ «مامزانم ڕاو کرد، شوتییانم شکاند، خانوانم ڕماند...» لەم حاڵەتەدا وشەکان لە شێوەی تاکدا دەمێننەوە بەڵام واتا گشتییەکەیان بەرەو «کۆ» دەباتەوە وەک «مامزان ڕاو کردن، شوتیم خواردن...» سەیری چۆن ڕاناوی «ن» ی کۆ خرایە دوای فیعلەکانەوە هەرچەند فاعیلەکەشیان ئاخێوەری تاکە، وشەی مەفعولەکانیش هەر تاکە.

حاڵەتێک هەیە مەدحی تێدایە بە گشتی ڕێژەی کۆی بۆ بەکار دێت وەک: دارا کوڕی پیاوانە، زێبا گوڵی باغانە، ژیرۆ بەچکەی شێرانە.

لەو شوێنانەدا کە ڕێی ڕێژەی کۆ بەرفەراح نییە و پێویستیشمان پێی هەیە هەمیشە دەتوانین بە هێنانی نیشانەی تەعریف وشان بکەینە کۆ وەک: پیاوەکان هاتن، ژنەکان چێشتیان لێنا، هەنارەکانم بردە بازاڕ.

حالەتێکی دیکەش هەیە پێوەندی بە بەلاغەتەوەیە، لەویشدا وشەی «تاک» دەلالەتی «کۆ» ی دەبێت، ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە لە وشەکەدا مەبەست «مطلق» ی واتای کۆ وەیا کۆمەڵێکی نامەعلوم بێت نەک چەند کەسێکی دیارکراو، گوتراوە:

«دەربەندی ڕێ نەبوو، کوڕان کردە ڕێ» لێرەدا «مطلق» ی کوڕ مەبەستە.

کە گوتت «ژنان سماقەکەیان ڕنی» ویستوتە بڵێیت بەرەی ژنان نەک پیاو سماقیان ڕنیوە.

دەڵێی: پیاوان شاییەکەیان بەتاڵ کرد، گورگان مەڕەکەیان لەبن هێنا، مریشکان ماشەکەیان بەرەڵڵا کرد...

تاقمێک وشەی ناوی کات هەیە لە حاڵەتی «ظرفیة» دا حەز لە ڕیژەی کۆ دەکەن وەک:

بەهاران گەڕان خۆشە - واتە، لە بەهاراندا گەڕان خۆشە.
شەوان بە تێری دەنووم – مەبەستت «لە شەواندا» یە.
سبەینان زوو هەڵدەستم – دەتەوێ بڵێی «لە سبەیناندا».

دەبێ بشڵێم ڕاناوەکانی کەسی «ئێمە، ئێوە، ئەوان» هەروەهاش ناوی ئیشارە «ئەمانە، ئەوانە، هۆوانە...» لە هەموو حاڵاندا داوای ڕستەی سەر بە «کۆ» دەکەن وەک: ئێمە ڕۆیشتین، ئێوە دەنون، ئەوان ئازان، ئەمانە قوتابین، ئەوانە هەڵاتن، هۆوانە بەرخەکەیان کوشتەوە...

مەیلی بەکارهێنانی ڕێژەی «کۆ» لەم سێ بەیتەی مەلای ئیبنو ئادەمیش بەدیار دەداتەوە:

هەوران کردە گوڵەگوڵ
میکائیلا ئەتوش دەی
توتن و ماشان برشێنە
دەبا نۆش بێتە سەر دەی

ڕۆمی ئەوا پەیا بوون
کوتوبخانان دەکەن «طی»

جا کە من بێم لەم ڕێبازە یەکجار ڕوون و ڕەسەن و ڕاست و دروستەی تەعبیری مێژوکردی زمانی کوردییەوە بڵێم «... لەم نووسینەمدا خوێندەواری عادەتیشم لە حیسابان دەرهاویشتوە...» هەقمە چاوەنۆڕی ئافەرین لێ کردن بم نەک توانج تێ گرتن. من چوزانم نووسەری کورد هەیە تا ئەم ڕادەیە نابەڵەدی زمانەکەی بێت؟ بەو پێیە دەبێ تەعبیری «چوزانم» یش، کە تازەم بەکارهێنا، لە توانجان بپەڕێنمەوە، وشەی «بپەڕێنمەوە» ش لە دەست ڕەخنەی کاڵ و کرچ ڕزگار بکەم.

بەکارهێنانی «حیسابان» لەو شوێنەدا، سەرەڕای ئەوەی لە ڕێبازی زێدە دروستی کوردییەوە بۆ ناو نووسینەکەی من هاتوە، مەبەستێکی بنجیشی ڕاگەیاندوە، من کە دەڵێم «لە حیسابانم دەرهاویشتوە» ڕێم هەیە بڵێم مەبەستم حیسابی زمان و ئەدەب و تێکڕای ڕۆشنبیرییە کە دەکاتەوە چەند حیسابێک و واتای «کۆ» بە دەستەوە دەدەن، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستم حیسابی ناو تاکە باسی ڕێزمانە بە نیازی ئەوەی کە لە هەموو سەروبەرێکی ڕێزمانی دەربهاوێژم، دیاریشە ڕێزمان صەد سەروبەری هەیە.

بە خۆڕایی نییە هێندە لە نووسەری کورد دەپاڕێمەوە کە خامەی خۆی ڕابێنێ بەو تەعبیرە ڕەسەن و بەلیغانەی کە لە شێوە جۆرجۆرەکانی ئاخاوتنی کوردیدا هەن. نابێ و ناشێ تەعبیری کوردی ڕەسەن کوێر بکرێتەوە هەر لەبەر ئەوەی نووسەران نەیانبیستوون. بێگومان هەرچی تەعبیری نامەئلوف هەیە ئەگەر هی ناوچەی ئەو نووسەرانە بایە ئێستا دەبوو بە شێوە ئەدەبی کوردی چونکە دەبینین غەڵەتەکانی ئەو تەرزە شوێنە خەریکن خۆیان بەسەر شێوەی ئەدەبیماندا دەهێنن (وەک: تیایا و شتی دیکەش).

ڕەخنەگرتن لە بەکارهێنانی «دەرهاویشتن» یش، وەک لە گوتارەکەدا کراوە، هی سەراویی و سافیلکەیی گوتارەکەیە و چ پێوەندیی بە زمان و ڕێزمان و ڕۆشنبیریی و ڕەخنەی ڕەواوە نییە. منیش و تۆش لەوەدا ئازادین بڵێین لە حیسابانم دەرهاویشتوە - دەرمهێناوە - لام داوە- دوورم خستۆتەوە... خۆ نایەین هەرجارە ویستمان وشەیێکی فەرهەنگ بۆ مەبەستێک بەکاربهێنین پرس بە نووسەرانی ئەو گوتارە وەیا لایەنێکی دیکە بکەین، تەنها ئەوەندە هەیە وشەی «دەرهاویشتن» لەو شوێنەدا کە بەکارمهێناوە لەبارتر و ڕاستتر و بەلیغترە لە «دەرهێنان» چونکە من کە دەڵێم «دەرمهاویشتوە» خۆم لەناو باسەکەدام و ئەو کەسانە دەردەهاوێژم بۆ دەرەوە، ئەگەر بڵێم «دەرمهێناوە» دەبێ خۆم لە دەرەوەی باسەکە بم. بە نموونە کە تۆ خۆت لەناو چاڵدا خۆڵ بۆ دەرەوە فڕێ بدەیت دەڵێی «هێندەم خۆڵ لە چاڵەکە دەرهاویشت» بەڵام کە بە دەولکە قوڕ هەڵکێشیت بۆ دەرەوەی بیر دەڵێی «هێندەم قوڕ لە بیرەکە دەرهێنا...» ئەمەش لە بەدیهیە ڕوونترە و یەکێک فەرقی پی نەکات گوناهە دەم لە زمان و ئەدەب بدات چونکە گەنجی تازە پێگەیشتوو بەهەڵە دەبات، ڕەنگە لە دوا ڕۆژیشدا ببێتە ڕابەر بۆ سەرچاوەی لێکدانەوەی نادروست.

هەر لەو کاتەدا کە گوتارەکە ڕەخنە لە «حیسابان» دەگرێت هەڵەیێکی گەورەی ڕێزمانی کردوە کە ئەویش دەچێتە نێوان باسێکەوە ڕەنگە تا ئێستا زماناسانی کورد قسەیان لێوە نەکردبێت. گوتارەکە لە قاڵبی خۆ شارەزا کردندا دەڵێ «جا نازانم چۆن لێرەدا لەسەر چە پەیڕەوێ بەکار هاتوە». لەم ڕستەیەدا دوو وشەی پرسیاری «چۆن، چە» هاتوونەتە سەر یەک مەبەست
ئەویش «بەکارهاتن» ـە چونکە مەبەست ئەوەیە بپرسێ «چۆن بەکار هاتوە؟ لەسەر چ پەیڕەوێ بەکار هاتوە؟»، لە کوردیدا، هەروەک لە هیچ یەکێک لەو زمانانەی من تێیان دەگەم، جایەز نییە لەیەک ڕستەدا دوو جاران لەیەک شت بپرسرێت. تۆ ڕێت نییە بڵێی «کەی دەچیتە کوێ — چۆن ئەتۆ کێیت — بۆچی کوا خواردنەکە...» هەروەک لە عەرەبیشدا ناگوترێ «متی تذهب الی

اين – كيف هو من – لماذا الى متى تضحک». جارێکیان بۆ پێکەنین لە منداڵێکی خۆمم پرسی «ئەرێ ئێمە کەنگی چ دەکەین؟» منداڵەکەش تەواوێک پێکەنی. ئەم ڕاستییە سەرەتاییە ئەگەر باسیشی لێوە نەکرابێ هی نەزانین نییە، ئیتر نازانم بڵێم هەڵە تێدا کردنی لە چییەوە هاتوە.

کوردی لەگەڵ عەرەبی لەمەدا جووت دەڕۆن، بەڵام لە بەکارهێنانی «ئایا» و «هل» دا لە یەکدی دەترازێن. کورد دەڵێ «ئایا کێ دەوێرێ لەم ڕازەوە سەرکەوێ». لە عەرەبیدا ناگوترێ «هل من يستطيع التسلق؟...». فارسییش وەکوو کوردییە. لەمەوە دەردەکەوێت «ئایا» ی کوردی لە ڕووی هێزەوە ناگاتە «هل» ی عەرەبی، بەڵکوو هەر بایی «يا ترى» پرسیاری تێدایە چونکە دەگوترێ «يا ترى من سيفوز بالجائزة – يا ترى هل سيأتي زمان؟...».

بە دوا ئەمەدا ڕەخنەییێکی نالەباری دیکەی لەوەدا گرتوە کە من گوتومە نووسینەکەی ناو «حەشارگە...» ڕووی لە خوێنەرانی عادەتی نییە، ئەو ڕێزماننناسەشی بە بەرچاوەوە نەگرتوە کە هەر خەریکی باسە بەرچاوەکانی ڕێزمانن.. گوتارەکە ئەم قسەیەی منی وەها لە قەڵەم داوە کە گۆیا قسەکە خۆی بە «سەنگی محەک» داناوە لە دانانی پلەی خواروژوور بۆ خوێنەر و ڕۆشنبیرانی کورد... هەڵبەت ئەم بۆچوونەی گوتارەکە هیچی بەسەر هیچەوە نییە و خۆ بەسەهو بردنێکی ئانقەستە بۆ تاکە مەبەستی ڕەخنە... بابزانین من چیم نووسیوە.

لە لاپەڕە چواری «حەشارگە...» دا دەڵێم «من لەم گوتەیەمدا بەسەر ئاخێوەری عادەتیدا دەکشم...» دواتر هەر لەو لاپەڕەیەدا دەڵێم «ئەوەی ڕاستیی بێ لەم نووسینەمدا خوێندەواری عادەتیشم لە حیسابان دەرهاویشتوە». ئنجا لە لاپەڕە پێنجدا دەڵێم «نووسینەکەم ڕوو لەو ڕێزمان شناسانەش ناکات کە ڕاهاتوی باسە بەرچاو و ناو دەرکردوەکانی ڕێزمانن..».

کەواتە من ڕووی قسەم لەم سێ تاقمەی خوارەوە نییە:

1- ئاخێوەری عادەتی
2- خوێندەواری عادەتی
3- ئەو ڕێزمان شناسانەی کە لە باسی بەرچاو و ناودەرکرد و ڕاهاتوون.

ئێستا، من کە دێم دوای ئەو تەرزە ڕەخنە یەکجار سافیلکەی نێو گوتارەکە چاو بەو نووسینەی ناو «حەشارگە» دا دەهێنمەوە پتر لە «حیساب بەدەر» کردنی ئەو سێ تاقمە ڕازیم چونکە بە ڕاستی، باسەکانی ناو «حەشارگە» هی وەهایان تێدایە چاوی یەکجار وردبین و زیهنی خۆتەرخان کردوو نەبێ هەر تاقەتی خوێندنەوەشیانی نییە چ جایی هەزم کردنیان. لەمەش بترازێ هەقی خۆمە بڵێم نووسینی من ڕوو لە فڵانە تاقم و فیسار جەمات دەکات وەیا ناکات هەر وەک هەقی تۆ و هی تریشە نووسینەکانتان بەرەو ئەو لایەنە بکەنەوە کە ئارەزۆتانە لە کەسیشتان بە عەیب ناگیرێ ڕووی قسەتان لە هەموو عالەم نییە. هەڵبەت قسەکەی من لە وەهم و وڕێنە و خەیاڵیشدا ئەوە ناگەیەنێ کە وا من ئەو خەڵقەم بڕبڕ کردوە و پایە و ڕوتبەی سەقافەتم بۆ هەر بڕەیان دەست نیشان کردوە، لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ عالەم لە خۆوە بێ خواهشتی من و تۆ بڕبڕ و خوار و ژوورن، تەنانەت قوتابی قوتابخانەکان بەسەر بیست و ئەوەندە پلەیەدا دابەش دەبن، مامۆستاکانی فێرگە بەرزەکانیش چەند پلەی بەرز و نزمیان هەیە… یەکێک نەختیک ئینساف بەکاربهێنێت دەتوانێ مافی ئەو تەرزە قسەیەم پێ بدات کە بێت و سەیری ئەو مەتەڵە بچوکەی سەرەتاکانی لاپەڕە 17 ی حەشارگە بکات و بیەوێ تێبگات بۆچی لە دوو فیعلی «دەمگرن، دەمگرتن» دا ڕاناوەکان دەوری فاعلیەت و مەفعولیەتیان لە فیعلێکەوە بۆ ئەوی دیکە دەگۆڕێ! بەر لەوەی نووسینەکەی من ئەم پرسیارە هەڵستێنێت چ ڕێزمان شناسێکم نەدیت خۆی لە پرسیارەکە گەیاندبێت. کەس نەهات بڵێ بۆچی ڕاناوی «م»
لە «دەمگرن» دا مەفعولە و لە «دەمگرتن» دا فاعلە، هەروەها ڕاناوی «ن»

لە فیعلەکەی یەکەمدا فاعلە و لە هی دوەمدا مەفعولە کەچی هیچ کامێکیشیان جێگەی خۆیان نەگۆڕیوە...

زۆر بە داخەوە گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» هەر جارە کە لە قورتێکەوە هەنگاو هەڵدێنێت یەکسەر و دەرلەحزە دەکەویتە قۆرتێکی گەورەتر و قووڵتر، وەک هەر ئێستا دەبینیت تەپەی لە بنی بیرێکی چەند قووڵەوە هێناوە. ئەم جارەیان هەڵکێشانەوەی گوتارەکە بۆ دەرەوەی ئەو بیرەی تێی کەوتووە لە دەسەڵاتی کەسدا نییە ئەگەر گوتارەکە تاقەت و تینێکی زۆر نەداتە خۆی و بەوەدا نەختێک شارەزایی لە بەدیهیاتی زمان و فۆنەتێک پەیدا نەکات چونکە بەڕاستی نەشارەزایی و کوێرەواریی گوتارەکە لەوانە نییە هیچ مامڵەتێکی خوێندەواریی لەگەڵدا بکرێت. ئەو هەڵە زلانە کە هەر ئێستا هەڵیان دەوەشێنمەوە حیکایەتی کابرای نەخوێندووم بە بیر دەهێنێتەوە کە لە جیاتی نووسینی «مار» هەستا خەتێکی جینگڵاوی کێشا و بە ماری تێگەییشت کۆڵێکیش کەیفی بەخۆی هات.

بە دوا بەند و باوە بێبنجەکەی «لە حیسابان دەرهاویشتوە» گوتارەکە ئەمجارەیان قۆڵ و باسکی سافیلکەیی خۆی بە شمشێری خامە کولەکەیەوە لە ئاشەکانی «سانکۆپانزا» هەڵماڵیوە و ڕەخنەی لەوە گرتوە کە لە لاپەڕە سێی «حەشارگە...» دا گوتومە «...کابراییێکی ڕۆژاوایی ناتوانێ دەنگی لامە قەڵەوەکەی ناو وشەی الله دەربېڕێت...» گۆیا بەمەدا من فەرقی نێوان «پیت» و «دەنگ» ناکەم... دەک ماڵی هەڵە و نەشارەزایی خراپ بێ، چۆن دەزانێ ڕەتەڵی وەها ناقۆڵا بە مرۆڤ ببات، ئەو مرۆڤە هەرچی دەبێ با ببێ!!

ئێستا دەبێ کە دەرسی ئەلفبێتەکە بە قوتابی پۆلی دوەمی فێرگەی سەرەتایی دەڵێیت منیش لەسەرەخۆ و بە زمانی ساوایان بە گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» بڵێم، چ زاراوەی «لامی قەڵەو» بەکاربهێنم و چ شکڵی «ڵ» بنووسم

هیچ کامێکیان «دەنگ» نین چونکە دەنگ دەبیسرێ و نادیترێ و نانووسرێ و ناوهێنانیشی بارستی نابێت. هەروەک کە گوتم «دارا» ڕەمزێکم بەکارهێناوە بۆ ناسینەوەی ئەو کەسەی مەبەستمە، هەروەهاش کە نووسیم «ڵ» وەیا گوتم لامی قەڵەو وەیا ناوێکی دیکەی لێبنێم، لە هەموو حاڵاندا ڕەمزێکم بۆ دەنگێکی دیارکراو بەکارهێناوە. گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» ش کە بەوپەڕی بایی بوونەوە وا دەزانێ شکڵی «ڵ» دەنگە، بە تەواوی لە زانستی فۆنۆلۆجی پشترێ بووە و چ پێوەندیی بەو کارەوە نەماوە. دەتوانم بڵێم کە یەکێک نەیزانی زاراوەی «لامی قەڵەو» ناوێکە بۆ ناسینەوەی دەنگێکی مەعلوم
هەروەک «دارا» ناوە بۆ کەسێک، دواتریش وای زانی شکڵی «ڵ» دەنگە، ئەو تەرزە کەسە یەکجار بە درەنگەوە لە هەڵەی خۆی دەگات، یەکجار بە زەحمەتیش دێتە سەر ڕێبازی تێگەیشتنی باسەکانی زمان.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی دیکەشەوە با موژدە لەو گوتارە بێت، کە لە باسی فۆنەتیکی کوردی و عەرەبیدا بگوترێ دەنگی قاف و دەنگی لامی قەڵەو و دەنگی شین... باشترە لەوەی بنووسرێ «ق، ڵ، ش» چونکە لەوانەیە شکڵی «ق» لە دەمی چاپ کردندا بە «ف» بنووسرێت وەیا شکڵی «م» بە «و» بگۆڕێت. هەڵە کردن لە نووسینی شکڵی ئەو پیتە کوردییە و عەرەبییانەی کە وێنەی وەک خۆیان لە ئەبجەدییەدا هەیە ئاسانترە لەوەی هەڵە لە نووسینی ناوی پیتەکان بکرێ (دەڵێم ئاسانترە، ناڵێم هەڵە کردن لە نووسینی ناوەکە مومکین نییە) چونکە مەعلومە شکڵی «ف» لەگەڵ «ق» خزمن بەڵام ناوی «فێ» زەحمەتە بە هەڵە ببێتە «قاف».

لە ئینگلیزیدا ئەم کارە ئاسان نییە چونکە زۆر لە دەنگەکانی ئاخاوتنی ئینگلیزی بە دوو سێ شکڵ دەنووسرێن وەک کە دەنگی «ج» جارێکیان بە «j» و جارێکیشیان بە «d» و جاری سێیەمیشیان بە «g» دەنووسرێ «judge – جەج – education – ئێجوکێشن»، دەنگی «ک» دەشێ بە « ch, q, k, c» بنووسرێت، بەو پێیە هەر جارە دەبێ بڵێی «فڵانە دەنگ، وەک کە لە فڵانە

وشەدا دەردەبڕدرێت» ئنجا دەتوانی مەبەستت ڕوون بکەیتەوە. هەر لەبەر ئەم گرفتەیە دەبینین ئەو زمانانەی کە بە پیتی لاتینی دەنووسن ئەلفوبێیەکی تایبەتییان بۆ فۆنەتیک داناوە تاکوو بتوانرێ مەبەست بە چاکی ڕوون بکرێتەوە، سەیری فەرهەنگەکانیشیان بکەیت دەبینی زوربەی وشەکانیان دووبارە بە پێی هاتنە دەریان لە دەمەوە دەنووسرێنەوە.

خوێنەر سەرنج لەو قسە ڕەخنەلێگیراوەی من بگرێ کە گوتومە «دەنگی لامی قەڵەو» دەبینێ و ویستومە دەنگی ناو وشەی «أللە» ی عەرەبی پێ بناسێنمەوە، تەنانەت نیشانەی «شدە» شم خستۆتە سەر وشەکەوە «بنوارە دێڕی دەیەمی لاپەڕە سێی کتێبۆلکەی حەشارگە». جا کە من مەبەستم دەنگی ئەو لامەی نێو وشەی «اللە» بێت چۆن دەتوانم بڵێم دەنگی «ڵ»؟ کەی لە عەرەبیدا وشەی «اللە» هەیە؟ خوێنەران با سەیری ڕستەکانی دوای ئەو «اللە» یە بکەن و ببینن چۆن لە هەموو حاڵاندا شکڵی پیتەکانم بۆ ناساندنی دەنگەکان نووسیوە «وەک کە گوتومە دەنگی «ح» و دەنگی «ق» دێڕی دەیەم و یازدەمی هەمان لاپەڕە» ئنجا سەیری لاپەڕە شەش بکە کە دەڵێم ڕاناوی «م»، ڕاناوی «ن»... دواتریش بڕۆ بۆ لاپەڕە دە، یازدە و سەیری ئەو ڕاناوانە بکە، هیچ تاکێکیان غەیری شکڵەکەیان نە نووسراوە وەک «م، مان، ت، تان، ی، یان...». سەرلەبەری گوتارەکەی «فۆنەتیک چیمان بۆ بکا» ئەویش هەر وشەی دەنگی بەکارهێناوە...

من چی بڵێم لەگەڵ گوتارێک کە داوا بکات لە جیاتی دەنگی «لامە قەڵەوەکە» - دەڵێمەوە لامە قەڵەوەکە - ی ناو وشەی «أللە» ی عەرەبی پیتە کوردییەکەی - دەڵێمەوە پیتە کوردییەکەی - «ڵ» بە نیشانە دابندرێت؟ چۆن لەگەڵ زەینی وەها بە هەڵەدا چوو و پشت لە ڕووناکی بتوانم بە شێوازێکی مەفهوم بئاخێوم؟ بڵێم چی؟ گوتارێک کە لەو قسە ڕاست و دروستانەی ئەو لاپەڕە سێیەی نووسینەکەم نەگات و لامی ناو «اللە»

بە «ڵ» بزانێ، قەڵەمی بەستەزمانی من لە کوێوە قسەی مەفهومتر بهێنێت و چۆنی بهاوێتە ناو ئەو زەینەی کە دەرگەی بۆ بەدیهییەش نەکردۆتەوە؟

بە ڕاست ئەگەر هاتین و مەنعی بەکارهێنانی ناوی دەنگەکانمان کرد و گوتمان نابێ بگوترێ «لام، قاف، جیم، شین...» ئەوسا عەرەبی لێرە بە پێشەوە و ئێستا چۆن ڕێیان دەبوو پەنجە بۆ دەنگی «الجیم المعطشە» ڕاکێشن، خۆ هیچ وێنەی تایبەتی لە کۆن و لە نوێدا بۆ ئەو دەنگە قەرارداده نەکراوە، یاخود کە بیانەوێ لە جێگەی «الکاف الفارسیە» دا شتێک بڵێن نەوەک گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» لێیان بە دەنگ بێت چییان پێ دەکرێ؟ خوێنەری کورد با بە هەموو گوتارەکانی سەر بە فۆنەتیکی عەرەبی و فارسیدا بێتەوە و ببینێ چۆن بە زۆری ناوی پیتەکان بەکاردەهێنن لە جیاتی شکڵەکانیان تەنانەت زۆر جاران نووسەرە عەرەبەکان بە نیازی پتر ڕوون کردنەوە دەڵێن «اخت الطاء، اخت الصاد» لە جیاتی «ظ، ض». دوایین گوتارێکی لەم بابەتەم خوێندبێتەوە ئەوەیە لە لاپەڕە 182 – 187 ی گۆڤاری «الاقلام» – ژمارە 4، کانونی دوەمی 1978 دا بڵاو کراوەتەوە لە ژێر عینوانی «قضیة الجیم فی اللغة العربیة». سەیری چۆن دەڵێ «الجیم» و نەینووسی «قضیة ال ج» خۆ هەر نەبێ نووسینەکە سەد هێندەی گوتارەکەی ناو «ڕۆشنبیری نوێ» شارەزای زانستی دەنگە!! بە داخەوە ساوایی ئێمە لە چاو میللەتانی دوور و نزیکی جیهان پتر لەو کارانەدا دەردەکەوێ کە پتر پێویستی بە پێگەیشتن و تێگەیشتن هەیە. سەیر لەوەدایە، چی تا ئێستا گوتومە لەبارەی ئەو هەڵە زلەوە بەشێکی هەڵەکەیە و نەختێکی کەمی خۆ بەسەهو بردنی گوتارەکەی ڕوون کردۆتەوە!!

خوێنەری کوردا ڕەنگە من، ئەم ڕەخنە بێسەروپێیە و بێ ئینساف و بی هەموو شتەم لێ گیراوە، یەکێک بم لە چەند کەسی کورد کە بە شێوەیەکی مەیلەو مەفهوم فەرقی نێوان دەنگ و پیتیان باس کردبێت. تا ئەم دەمەی کە من خەریکی ڕاست کردنەوەی حاپولەکانی ئەو گوتارە بەستەزمانەم، ڕەنگە چاوم بە نووسینی نووسەرێکی کورد نەکەوتبێت بە تایبەتی و بە چاکی «دەنگ»

و «پیت» ی لەیەکدی جودا کردبێتەوە مەگەر ئەوەی خۆم لە لاپەرە 300 ی بەرگی پێنجەمی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، ساڵی 1977، لە ناوتوێژی گوتاری «هەڵدانەوەی چەند ڕوپەڕەیەک لە زمانی کوردی»، لەژێر عینوانی «دەنگەکانی ئاخاوتن یەک ڕاستی بزرکراو» دا نووسیومە. هەرچەند چی لەو لاپەڕە سێیەی «حەشارگە» دا نووسراوە بۆ خۆی بە تەنها گەلێک زیادە لە پێویستی پووچاندنەوەی ئەو ڕەخنە پف دراوەی ناو گوتارەکە، دیاسن چی لەو لاپەڕە 300 ەی گۆڤارەکەی کۆڕیشدا نووسراوە جارێک و دەجاری دیکە ئەو ڕایە سەراوانە لە جێی ڕەوای خۆیاندا دادەنێت. من لەو لاپەڕەیەدا ئەمەی خوارەوەم نووسیوە.

«مەبەس لە دەنگەکانی ئاخاوتن ئەوانەن کە لە ڕێنووسدا ئەلف و بێ و قاف و شینان بۆ کراوە بە نیشان. ئەوانەی لە بری وشەی «دەنگ» وشەی «پیت» بەکاردەهێنن کەرستەی گفتوگۆ تێکەڵ بە کەرستەی نووسین دەکەن چونکە ئەوەی لە زارەوە دەدرێت دەنگە نەک پیت...» دواتر دەڵێم «... بە نموونە، کە دەڵێین بەرد چەند دەنگێک لە زارمانەوە دەردێت وشە پێک دەهێنن نەک شکڵی ((ب، ە، ڕ،د))». هەر بە دوا ئەمەشدا تێبینییەکی ڕوونکەرەوەم کردوە کە دەڵێم «عەرەبەکان لە کۆندا فەرقی نێوان دەنگ و پیتیان نەکردوە و بۆ هەردوویان وشەی«حرف» یان بەکارهێناوە، بگرە ئەم وشەیان بۆ «حروف القواعد» یش گوێزاوەتەوە و گوتویانە ((حرف العطف، حرف الجر ...الخ))». ئنجا لە سەرەتاکانی لاپەڕە 301 دا دەڵێم «... نووسینەکەم لیرەدا باسی دەنگ دەکات و زۆر جاران وشەکە دەهێنێتە ناوەوە بۆیە پێویستم زانی کە لە پێشەوە بڵێم مەبەست لە دەنگ «دەنگی زمانی – صوت لغوی» چییە تاکوو لە هەر شوێنێک وشەکە هاتە ناو نووسینەوە زیهنی خوێنەر بۆ ئەو واتایە بباتەوە نەک دەنگی با و ئاو و تەیر و ئاژەڵ و فیکە و لرخەی سنگ و... هتد».

وا بزانم چی لێرەدا خستمە بەرچاوی خوێنەر ئیسپاتی ئەوە دەکات کە من لە هەموو ڕوییێکەوە فەرقی پیت و دەنگم کردوە نەک لە یەک ڕووەوە، بە

پێچەوانەی ئەوەی گوتارەکە دەیڵێت و ئەو هەموو هەڵەیەی تێدا دەکات، هەتا بشڵێی لە خۆی بێ ئاگا بوە بەوەدا کەوا دەزانێ شکڵی «ڵ» دەنگە، بێ ئاگاییەکەی پتریش ئاشکرا دەبێت کە دێت و بەوپەڕی لەخۆبایی بوونەوە و بەو هەموو نەشارەزاییە بە توانج دەڵێ «... ئا ئەمەیە کاری فۆنەتیک ئەگەر دەپرسی ((فۆنەتیک چیمان بۆ دەکات!))» لەمەشدا گۆیا وەک مامۆستای فەندی «استخدام» گوتارەکەی خۆم، «فۆنەتیک چیمان بۆ بکا» م بە ڕوودا دەداتەوە، جا ئەگەر هەڵە سافیلکەکانی ناو ئەو گوتارەی «ڕۆشنبیری...» فێری فۆنەتیکمان دەکات خۆ هەر لێی بگەڕێین چاکترە...

بەهەمەحاڵ، چاونووقاندنی گوتارەکە لەو ڕاستییانەی هەر ئێستا خستمنە ڕوو لە بارەی «دەنگ» و «پیت» ەوە یا هی تێنەگەیشتنە، یاخود هی خۆنەناس کردنە، لە هەردوو حاڵیشدا مرۆڤ مافی ڕەخنە گرتن و
قسەکردنی «زانستکارانە» ی نامێنێ چونکە دەمدان لە بابەتی سەر بە زانست، ئەو زانستە چی دەبێ با ببێ، هەم باخەبەری پێویستە و هەم ئینساف و ڕاستگۆیی. یەکیک دوو وشەی پرسیار بخاتە سەر مەبەستێک «چۆن لێرەدا لەسەر چە پەیڕەوێ...» دواتریش چاو لە هەموو ڕایە ڕاست و دروستەکانی نووسینی بابایێکی وەک من بنوقێنێت ئنجا داواش بکات لامی ناو «الله» شکڵی «ڵ» ی بدرێتێ و واش بزانێ «ڵ» دەنگە، دەبێ چۆن پێشوازی لە نووسیەنەکانی بکرێ؟ من پەرۆشم بۆ خوێندەواری نەوباوە کە چاوی بە خوێندنەوەی نووسینی دور لە ئاگاداری و دور لە ڕاستیی و ئینساف ڕابێت و لە ئاکامدا هەستە پاک و پیرۆزەکەی «پەرۆش بۆ ڕاستی» لە لا کول ببێت سەرەڕای ئەوەی بیری کاڵ و ناپوختەی بە دڵ و دەروونددا بچێت... بڵێین چی، ئەمەیە حاڵی ڕۆشنبیریمان!!

ئێستا نۆرەی «دەم لە فارسی وەردان» ـە. دیسان یەخەی «هەرگیز» ی بەستەزمان گیرایەوە و گوتارەکە سەرلەنوێ پێی لەسەر «هەرگیز» داگرت و

گوتی «دەمی لە فارسییەوە وەرداوە!». جارێ من نەمگوتوە «دەمی لە فارسییەوە وەرداوە»، گوتومە «... لە کۆنەوە دەمیان لە فارسی وەردەدا».

هەروەک من ڕێم نییە عەیب لە سلێمانی بگرم لەوەدا کە دەڵێن «دەمی لێوە دەدا» هەروەهاش یەکێکی دیکە مافی ئەوەی نییە عەیب لە کۆیێ و شوێنی دیکە بگرێ لەو جۆرە ئاخاوتنە کوردییەی کە بە پێی ڕاهاتنی خۆیان وتوویژی پێ دەکەن. کۆیی دەڵێن «دەم لە فارسی وەردەدا»، دەشڵێن «دەم لە فارسی دەدا» بەڵام ناڵێن «دەم لە فارسییەوە دەدا» و بە بیریشیاندا نایەت لەوەدا ئاخێوەری سلێمانی بشکێننەوە. کە بێین و بە پێی ئاخاوتنی کۆیێ بۆ «ئاو» بڕۆین ئەوسا کۆیی دەڵێن «ئاو لە دەمی وەردەکا» و ناڵێن «... وەردەدا». لە نێوان «تێوەردان» و «تێوەر کردن» یش فەرقێکی ورد هەیە، خوا لە کەس هەڵناگرێ بە ناوی بووژاندنەوەی شێوەی ئەدەبی زمانی کوردی زمانی کوردی هەناسەی لێ ببڕێت. ئەوەی کوردی باش بزانێت و شەوکوێری زمانناسی نەبێت دەبێ هەست بەم ڕاستییە بکات. لەو وشانەدا کە بە هۆی «کردن، دان» ەوە پەیدا دەبن بە زۆری ئەو پێوەندییەی نێوان شتان کە وا «کردن» ـەکە پەیدای دەکات لکێنەرترە لە هی «دان». بە نموونە:

بەردێکم هەڵدا - بەردەکە لە من و لە هەموو شتێک دادەبڕێت.
ئاڵام هەڵکرد - ئاڵاکە بە دارەکەوە دەلکێت و لێی نابێتەوە.
زەردەواڵە بە پەنجەمیەوە دا - خێرابەخێرا زەردەواڵەکەم لێ دەبێتەوە.
دنکە تەزبێحەکەم بە داوێوە کرد - دنکەکە لە داوەکە نابێتەوە.
قەڵەمەکەم دادا - تڵێسمەکان لە قەڵەمەکەوە بەردەبنەوە و لێی دور دەکەونەوە.
گەنمەکەم داکرد - گەنمەکە لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە کە تێیدا داکراوە.

ئەم خاسیەتەی «کردن» بە زۆری لە واتای وشەکاندا خۆی دەنوێنیت مەگەر لەو شوێنانەی کە سروشتی داڕشتنی وشە و ئەو ئەداتەی تێیدا بەشدار

بووه «پێوەلکان» هەڵنەگرێت، وەک کە دەڵێی «دەرم کرد — دەرم دا» دیارە واتای پێشگری «دەر» دژی لکانە.

لە شیوە ئاخاوتنی کۆیەشدا کە دەڵێی «ئاوی لە زاری وەرکرد» ئاوەکە شتێکی مادییە و بەرهەستە، بە پوک و ددان و مەڵاشوو و زمان و هەموو ناوەدەم دەکەوێتەوە و زۆر لە نزیکەوە پێیانەوە دەلکێ بەڵام کە دەڵێی «دەم لە فارسی وەردەدا» قسەکان بە زارەوە نالکێن. قسە دەنگە و بڵاو دەبێتەوە. لەبەر ئەمە زۆر ئاشکرایە «ئاو لە زار وەرکردن» و «دەم لە زمانی فارسی وەردان» پتر ڕەسەنایەتی ئاخاوتنی کوردی پاراستوە لە «ئاو لە زار وەردان» کە
لەتەک «دەم لە فارسییەوە دان» بێت. لەگەڵ پاراستنی ڕەسەنایەتی، لایەنێکی بەلاغیش لەو بەکارهێنانەدا ڕەچاو کراوە. تۆ سەرنج بگرە «ئاو لە دەمت وەردەکەی» کەچی «دەم لە فارسی وەردەدەی» نەک «فارسی لە دەمت وەردەدەی»، واتە لێرەدا «ظرف و مظروف» بە پێی داخوازی حاڵ و بە پێی واتای وشەکە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. سەلیقەی زمانناسی «فطری» و زگماک لەو خەڵقەدا وەهای کردوە فەرق بەو وردەکارییە بکات.

بەدوا ئەمانەدا دەبێ تێبینیەکی زێدە گرنگی دیکەش بە خەیاڵدا تێپەڕێنین. «دەم تێوەردان، خۆ تێوەردان» لەو حاڵەتەدا بەکار دێن کە ناڕەزامەندی لەگەڵدا بێت. دەگوترێ «کابرا چ هەقی بەسەر ئیشەکەوە نەبو کەچی خۆی تێوەردا» هەروەهاش «دەم و زمان لە فارسی و عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی وەردان» نەزانینی ئەو زمانانە ڕادەگەیەنێت. وشەی «تێوەردان» تێپەڕی «تێوەرچوون» ـە وەک دەشزانین تێوەرچوون هەرگیز (دەڵێم هەرگیز) پەسەند نەکراوە.

ئێستا با بێینە سەر حیسابی «جووجەڵە». باسی ئەم وشەیە دوورودرێژە چونکە پێویست دەکات بە هەموو بارێکیدا وەرگێڕین و هەموو هاوتاو هاوشێوەکانی

بهێنینه ناو لێکدانەوەمانەوە «جووچکە، جووجیلە، جووچک، گجووک، گووجیلە...هتاد» بەڵام من لێرەدا زۆر بە کورتی خۆمی لێ ڕزگار دەکەم.

ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بۆ فەرخەی مریشک بەکارهاتوە و بەکار دێت، بەڵام ئێستا زۆر جاران بۆ فەرخەی ئەو باڵندانەش بەکار دێت کە ماڵی بوون وەک کەو، سوێسکە، عەلشیش، مروای، قاز. بەڵگەی ئەم ڕاستییە جگە لە بیستنی خۆم بەیتێکی حاجی قادریشە:

وەک مریشکێ کە عەقڵی نەیهێنێ
بێت و هێلکەی مراوی هەڵبێنێ
وەک بگاتە کەناری جۆگەلەیەک
بمرێ نایێتە شوێنی جووجەڵەیەک

دیارە لێرەدا جووجەڵە فەرخە مراوییە چونکە مریشکەکە هێلکەی مراوی هەڵێناوە.

سەیری فەرهەنگی مەهاباد[7] بکە ئەمانە دەخوێنیتەوە:

جووجە - فرخ
جووچکە - عصفور. الفرخ
جووجییلە - فرخ
جووچک - فرخ. طفل.

[7] «1» فەرهەنگی مەهاباد، هەولێر، چاپخانەی کوردستان 2573 کوردی ل: 193.

ڕەوانشاد گیوی موکریانی لە ئاست هیچ یەکێک لەو وشانەدا ناوی مریشکی نەبردوە، دیارە بە لایەوە وشەکان بە گشتی بۆ فەرخە و منداڵ ڕۆیشتون، هەروەک دیارە بەلای شێخی خاڵەوە وشەی «جووجەڵە» تایبەتی فەرخەی مریشکە بە پێی ئەوەی کە لە فەرهەنگەکەیدا دەیخوێنیتەوە.

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە لاپەڕە24 ی فەرهەنگەکەیدا لە واتای وشەی «جووجەڵە» دا دەڵێ Chick. بە پێی ئەوەی لە لاپەڕە 171 ی فەرهەنگی «المورد» دا هاتوە وشەی Chick ئەم واتایانە ڕادەگەیەنێ: صوص، كتكوت، صغير الطائر، فتاة.

لەمەوە دەردەکەوێ بەشێکی فەرهەنگناسان جووجەڵە بۆ غەیری مریشکیش دەبەنەوە. بەهەمەحاڵ، ئەوەی دەیزانم، لە بەری بابان جووجەڵە پتر بۆ فەرخەی مریشک ڕۆیشتووە، لەبەری سۆرانیش بۆ فەرخەی مریشک لە شێوەی «جووچکە، جوجیلە» بەکار دێت بەڵام بۆ غەیری مریشکیش دەشێت، جووجیلەش لە جووچکە ساواترە. خۆ ئەگەر ئەمانەش نەسەلمێنرێن من بەوەندە ڕازیم حیسابی بەیتەکەی حاجی قادرم لەگەڵدا بکرێ...

گوتارەکە دەیتوانی لە چەند ڕێبازێکەوە بەرەو ڕەخنەی بەڕێوجێ بڕوات ئەگەر نەختێک نیگای وردبین و ڕاست و دروستی هەبایە. بە نموونە، لە لاپەڕە 286 ی، بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی 1977 وشەی «ڕاگوێزتن» م بەکارهێناوە. دەشیا ڕەخنە لەم بەکارهێنانە بگیرێ ئەگەر سەرەتاییێکی یەکجار سەراو و دەست هەڵێنجی «فۆنەتیک» ی کوردی لێ بەخەبەر هێنرابایە، بەڵام دیارە تۆز لە ئاو هەڵناستێ چونکە مەعلوومە ئەو گوتارە ناتوانێ لە خۆوە بچێتە ناو سروشت و تایبەتیەکانی «دەنگ» ی کوردییەوە مەگەر لە دەرەوەی خۆیەوە دەستوورێکی دۆزرایەوەی فۆنەتیک بخوازێتەوە و ڕاماڵی زمانی کوردی بکات ئیتر یا جێی خۆی دەگرێت یا ناگرێت.

وشەی «ڕاگوێزتن» بە پێی داخوازی دەنگ بە تێکڕایی وەها داوا دەکات گۆڕانی بەسەردا بێت و دەنگەکەی «ز» ی تێدا بکرێتە «س» و ببێتە «ڕاگوێستن» چونکە دەنگی «ز» ئاوازەدارە[8] و دەنگی «ت» کپە و حەز لە یەکدی ناکەن.

داخوازی دەنگ لە زۆر حاڵدا فەرمان بەسەر چۆنیەتی گۆڕانی وشەدا دەدات. بە نموونە وشەی «دەزگا» لە «دەست گا» وە هاتوە. لە پێشەوە دەنگەکەی «ت» سواوە چونکە دەربڕینی لەو شوێنەدا زەحمەتە. کە «ت» لە نێواندا هەڵستا دوو دەنگی «س – گ» دەکەونە پاڵ یەکتر، دەشزانین «ش» کپە و «گ» ش ئاوازەدارە، بۆیەیە دەنگەکەی «س» بە ئاوازەدارێکی لە خۆی نزیک دەگۆڕدرێتەوە کە دەنگی «ز» ە و وشەکە دەبێتە «دەزگا».

وەک بە سەرنج دانیش دەردەکەوێ داخوازی ئاسان کردنی دەربڕینی «دەنگ» پتر بەرەو گۆڕینی دەنگی کپ بۆ ئاوازەدار دەڕوات نەک گۆڕینی ئاوازەدار بۆ کپ دەنا دەبوو وشەکە ببێتە «دەسکا» چونکە دەنگی «ک» یش کپە وەک «س»، بەڵام دەستوورەکە ڕیزپەڕی «شاذ» تێدەکەوێت وەک کە دوای پێچوکەیێک لێی دەدوێم.

ئەم سەرەتایەی فۆنەتیک شتێکی نوێی تێدا نییە و دەبێ هەموو ئەوانەی دەم لە فۆنەتیک دەدەن لێی بووبێتنەوە، تەنانەت هێند ئاشکرایە مامۆستاشی پێ ناوێ، بەڵام بە نیسبەت «ڕاگوێستن» ەوە کە من بەکارمهێناوە مەسەلەکە وەها ڕوون و دەست هەڵێنج نییە.

---

[8] لە عەرەبیدا بە «ئاوازەدار» دەڵێن «مجهور». بە «کپ» یش دەڵێن «مهموس».

له كورديدا دیاردەی دەنگی «ز» و چۆنەتی مامڵەت لەگەڵدا كردنی له هەندێ ڕووەوە لێكۆڵینەوەی دەوێت. دەزانین و گوتمان دەنگی «ز» ئاوازەدارە، ئنجا با بزانین چۆن لەگەڵ دوو دەنگی «ت، د» دا ڕەفتار دەكات.

دەنگی «ت» كپە و بە عادەت «ز» حەزی لێ ناكات چونكە خۆی ئاوازەدارە و ئەمەش شتێكی سەیر نییە، بەڵام سەیر لەوەدایە كە دەنگی «ز» پتر دوشمنی دەنگی «د» ە هەرچەند ئەویش وەك «ز» ئاوازەدارە. سەیرێكی فەرهەنگی كوردی بكە، ڕەنگە وشەی تێدا نەبینی دوو دەنگی «ز، د» بەم شێوەیە تێیدا بە دوا یەكدیدا هاتبن مەگەر وشەكە لێكدراو بێت و لە دوو وشەوە دەنگەكانی «ز، د» كەوتبێتنە تەنیشت یەكتر، وەك كە دەگوترێ «نازدار، بازدان، پزدان، پەزداریی، ڕەزدار...» وا پێ دەچێ، ئەم حەزنەكردنەیە وای كردوە ئەو وشەی لە فارسیدا دوو دەنگی «ز، د» ی كۆ كردۆتەوە، لە كوردیدا «د» ەكەی دۆڕاندوە وەك:

| وشەی فارسی | وشەی كوردی |
|---|---|
| مزد | مزە |
| دزد | دز |
| هورمزد | هۆرمز |

له كورديدا فیعل هەن لە ڕابردوو و ئایندەدا ئەم وێنانە وەردەگرن

| | |
|---|---|
| گەستم | دەگەزم |
| گەزیم | دەگەزم |

| | |
|---|---|
| گواستمەوە | دەگوازمەوە |
| گوێزامەوە | دەگوێزمەوە |
| گوێزیمەوە | دەگوێزمەوە |
| خواستمەوە | دەخوازمەوە |
| خوازیمەوە | دەخوازمەوە |

ئەم فیعلانە بە فیعلی دیکەی وەک خۆیان بگرین و بەراوردیان بکەین:

| | |
|---|---|
| بەستم | دەبەستم |
| ڕێستم «ڕستم» | دەڕێسم |
| بیستم | دەبیسم، دەبیەم |

دەبینین لەم سێ فیعلەدا نە لە ڕێژەی ڕابردوو نە لە ڕێژەی ئایندەدا دەنگی «ز» دەرناکەوێت. ئایا لەبەرچی تاقمەکەی پێشوتر «گەستن، گواستنەوە، خواستنەوە» دەنگگۆڕییان تێدا کراوە؟

هەرچەند بە شێوەیەکی لە گومانبەدەر وەرامێکم بە دەستەوە نییە، بەڵام کە بێین و ئەم دەنگگۆڕییە لەو فیعلانەدا بخەینە بەر تیشکی ئەو دیاردە فۆنەتیکییانەی کە پێوەندییان بە فیعلەکانەوە هەبێت، بە تایبەتی ڕواڵەتی «ڕاگوێزتن» کە پێچەوانەی سروشتی دەنگی کپ و ئاوازەداری تێدایە، وا دەزانم هۆی دەنگگۆڕییەکە لە «س» ەوە بۆ «ز» دەگەڕێتەوە بۆ حەزنەکردنی دەنگی «ز» لەو «د» ەی کە بە دوایدا دێت. وا پێ دەچێ فیعلەکان لە کۆندا «گەزدن، گوازدنەوە، گوێزدنەوە - خوازدن، خوازدنەوە» بووبن ئیتر، لەوەبەولاوە هەریەکێک لە فیعلەکان بە پێی دەستووری دەنگگۆڕیی شیوەیان گۆڕابێت بەم جۆرەی خوارەوە:

فیعلی «گەزدن» لە دوو ڕێگەوە دەنگەکانی «ز، د» ی لەیەکدی دابڕاون:

1- بە هێڵانەوەی دەنگی «ز» و گۆڕینی «د» ەکە بۆ «ی» فیعلەکە بووبێتە «گەزین». گۆڕینی «د» بە «ی» لە کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. حاجی قادر دەڵێ:

بێ بەستە فەلەک ئاشەکی وای ناوەتەوە
بۆ «هاڕدنی» ئێمە چ عەجاییب دەگەڕێ

وشەی «هاڕدن» لە جێی «هاڕین» بەکار هاتوە، دەڵێی بۆ ئەسڵی خۆی بردراوەتەوە.

2- بە گۆڕینی هەردوو دەنگی «ز، د» بۆ «س، ت» بە پێی ئەوەی نزیکترین دوو دەنگی کپ بۆ «ز،د» ئەم  دوو دەنگەی «س، ت» ە کە زۆریش حەز لەیەکدی دەکەن.

فیعلی «خوازدنەوە» ش دەشێ بە هەمان ڕێگەی باس کراوی «گەزدن» دا دوو شێوەی لێ پەیدا بووبێت:

1- گۆڕانی دەنگی «د» بۆ «ی» — خوازینەوە

2- گۆڕانی هەردو دەنگی «ز، د» بۆ دوو دەنگی «س، ت» — خواستنەوە

فیعلی «گوازدنەوە» بۆ «گواستنەوە» دیارە دەنگەکانی «د، ز» ی گۆڕاوە بۆ «س، ت». بەڵام دەبێ ڕواڵەتی «گوێزدنەوە» بنیچەی «گوێزانەوە - گوێزینەوە - گوێستنەوە» بووبێت.

گۆڕانی »گوازدنەوە» بۆ «گوێزدنەوە» لەو ڕێگەوە هاتوە کە فیعلی وەک «شاردنەوە» ی تێدا گۆڕاوە بە »شێردنەوە». لەوە بەولاوە

گۆرانی «گویزدنەوە» بۆ «گوێستنەوە» مەعلوومە چۆن بوە. هەروەها گۆڕانی بۆ «گوێزینەوە» ش وەک «گەزین، خوازین» بوە، بەڵام ڕواڵەتی «گوێزانەوە» دەنگەکەی «د» ی بە «ا» گۆڕیوە نەک «ی» بەمەشدا ڕێژەی فیعلەکە چۆتە سەر ڕێبازی کۆمەڵە فیعلی «کێڵان، هێنان، وێران، پێچانەوە...» و وەک ئەوان گەردان دەکرێت.

لەم ڕوون کردنەوەیەدا شتێکی بزر دەردەکەوێت. هەر دەڵێی کە من بڵێم «گەزتن، خوازتنەوە...» هاتوم دوو دەستووری فۆنەتیکم تێکەڵ کردوون. یەکێکیان ئەوەیە کۆنە «ز» ەکەی «گەزدن، خوازدنەوە» م هێناوەتەوە بۆ ناو وشەکە، دوەمیان ئەوەیە ئەو «ت» ەی کە لە دوا کاتدا بووبوە جێگری «د» ی وشەی «گەزدن، خوازدزەوە» بەردەوامم کردوە لەو شوێنەیدا و لەگەڵ کۆنە «ز» ەکەدا کۆم کردونەتەوە.

ئەم بەیەکەوە هێنانەوەی دوو دەنگ لە دوو ڕێی جوداوە شیوەی دیکەشی هەیە. وشەی «پشدەر — پژدەر» لە بنەڕەتدا «پشت دەر» ە. لە خۆوە دیارە هاتنی دەنگی «د» لە پاش دەنگی «ت» ی وەستاودا زۆر ناقۆڵایە و بە زەحمەت دەردەبڕدرێ، لەبەر ئەمە تێدەچێت و وشەکە بە کورت کراوی دەبێتە «پش دەر». ئنجا دەستوورێکی دیکەی دەنگی کوردی خۆ دەهێنێتە کایەوە.

دەنگی «ش» کپە و «د» ئاوازەدارە حەز لە یەکدی ناکەن. بە پێی دەستوورە بەرفرەوانترەکەی گۆڕینی کپ بە ئاوازەدار دەنگە کپەکەی «ش» بە دەنگێکی ئاوازەداری لە خۆی نزیک دەگۆڕێت و وشەکە دەبێتە «پژدەر». بەو پێیە ئاخێوەر و نووسەری کورد بۆی هەیە بنووسێ و بڵێ «پشدەر، پژدەر».

وشەی «ناسک» بە ئەسڵ لە «ناز» ەوە هاتوە و پاشگری «ک» ی پێوە لکێنرا، وەک دەشزانین دەنگی «ز» ئاوازەدارە و «ک» یش کپە. لیرەدا سێ

ڕێگە لە پێش ئاخێوەری کوردیدا کراوەتەوە. دەشێ وشەکە وەک خۆی بمێنێتەوە و بگوترێ «نازک» وەیا «ز» ەکە کپ بکرێت و ببێتە «س» کە لە خۆی نزیکە و وشەکە ببێتە «ناسک»، زۆر کەسیش کافەکە بە گاف دەگۆڕن، کە دەنگێکی ئاوازەدارە، وشەکە دەکەن بە «نازگ».

گۆڕانی «ز» بە «س» لە وشەی «ناسک» دا پێچەوانەی دەستوورە بەرفرەوانەکەی گۆڕینی دەنگی کپە بە ئاوازەدار چونکە لێرەدا ئاوازەدارەکەی «ز» لەبەر خاتری کپەکەی «ک» بۆتە «س» کە ئەویش کپە.

ئاگادار بوون لەم دەستوورانە یارمەتی ئەوەمان دەدات بە خۆڕایی نووسەر و ئاخێوەر بە هەڵەکردوو نەژمێرین کە هاتن و وشەیێکیان بە یەکێک لەو ڕێبازانەدا هێنا و لە ڕێبازی من و تۆ جودا بۆوە چونکە لەوانەیە ڕێبازەکەی ئەو لە هی من و تۆ دروستتر بێ. لە عەرەبیدا کە دوو دەنگی «ز، ت» لە «باب الافتعال» دا کۆ دەبنەوە دەنگەکەی «ت» دەبێتە «د» و ڕێ نییە وەک خۆی بمێنێتەوە وەیا «ز» ەکە ببێتە «س». «زهر» لە بابی «افتعل» دا دەبێتە «ازدهر»، نە «ازتهر» و نە «استهر» وجودیان نییە.

گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» ڕێی هەبوو لەوەشدا ڕەخنەم لێ بگرێ کە من وشەی فۆنەتیکم لە جێگەی «فۆنۆلۆجی» بەکار هێناوە، دیارە جوداوازیەکی ئاشکراش لە نێوانیاندا هەیە. ئەوەی ڕاستی بێ من کە «فۆنەتیک» م بەکارهێنا لەوەوە بوو کە نووسەرانی کورد بەر لە من دەستیان لە فۆنەتیک ڕاهاتبوو و بە واتای «فۆنۆلۆجی» شیان بەکاردەهێنا، ڕەنگە هەر خۆشم یەکەمجار ئیشارەتم بۆ جوداوازیی نێوان هەردوو وشە کردبێت (سەیری لاپەڕە 613، 614 بکە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم 1975 لەناوتۆژی گوتاری «فۆنەتیک چیمان بۆ بکا؟»).

هەرچەند زەرەرێکی گەورەش لەوەدا پەیدا نابێ کە لە جیاتی فۆنۆلۆجی بنووسرێ فۆنەتیک دیسان کە شارەزاییێکی بابەتەکان لەناو بێگانەدا ببینێ نووسەری کورد وشەیەک لە جێگەی یەکێکی دیکەدا بەکار دەهێنێت ڕەخنە بە دڵی خۆیدا تێ دەپەڕێنێت، هەقیشیەتی. وەک بزانم، تا ئەم کاتە جوداوازیی نێوان وشەکانی Phonology, Phonetics, Phonetic لە کوردیدا ڕوون نەکراوەتەوە، کارەکەش زۆر گران نییە بەڵام ئێرە جێگەی لەباری ئەو کارە نییە.

بە هەمەحاڵ پێویستە کەسانێک ئەرکی ڕوون کردنەوەی واتا ڕاستەقینەکەی ئەو وشانە بگرنە ئەستۆیانەوە کە دەزانن وشەکان چییان بە بەرەوە هەیە و چ ڕادەگەیەنن و چۆن ڕووناکایی بۆ ناو ناوەڕۆکی زمان – بەتایەبەتی زمانی کوردی – دەهاوێژن. نەک بێن و لە کتێبەکی عەرەبی وەیا فارسی وەیا ڕووسی وەیا... باسەکانی سەر بە فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی بە نیوەچڵی وەرگێڕنە سەر زمانی کوردی و لەبەر تازەیی باسەکەش چی غەڵەت و پەڵەت هەیە ببێتە بنەمای باسی فۆنۆلۆجی و فۆنەتیک لەلای ڕۆشنبیری نەوباوی کورد وەک کە «ڕاناوی لکاو و نەلکاو» خۆی بەسەر بەشێکی سەرلەبەری ئاخاوتنماندا دابڕی و وەهاش جێگیر بوو بە کەس ناکرێ دەریبکێشیت. وشەی «فرمان» یش کە لە بری «کار، فعل» ڕۆیشتووە ئەویش هەر لە نەشارەزایی ئەو کەسە بووە کە یەکەم جار بەکاریهێناوە، دیارە وشەکەشی لە زاری نەخوێندوان هەڵگرتۆتەوە کە دەڵێن «فرمانی خۆم بەجێهێنا» مەبەستیشیان «ئەو کارەی پێویستە لەسەرم بیکەم» ە، وشەکەش لە «فەرمان – بە واتای «امر» ی عەرەبی» وەرگیراوە وەک کە «واجب» بۆ «کاری پێویست» ڕۆیشتووە. جا ئەگەر «فرمان» بۆ «کار، کردار» ی کوردی دەست بدات دەبێ «واجب» یش بۆ «فعل» ی عەرەبی جایەز بێت...

مەسەلەی زمان وەک ڕامیاری و ئەدەب نییە هەڵەی «ڕاناو» ی لێ نەبێتە عەیبی گەورە. دەشێ خەڵک لەبارەی ڕامیاری و ئەدەب و ئابورییەوە زۆر

لەیەکدی دوور بکەونەوە و هەر لە جغزی بەرژەوەندیشدا بمێننەوە چونکە ئەمانە لە گۆڕاندان بە تایبەتی ئابوری و ڕامیاری، بەڵام زمان تەحەمولی هەڵەی گەورە ناکات، ئەو گۆڕانەی بەسەریشیدا دێت نابێ ئاوەژووی بکاتەوە. شۆڕش لە ڕامیاری و ئابوریدا کارێکی چاوەڕوان کراوە، کەچی زمان، بە تایبەتی دەستوورەکانی ڕێزمان، کە تەقڵەی پێ لێ درا نەفەسی دەبڕێت. ئەگەر گوتارەکەی «ڕۆشنبیری» ڕەخنەی لە کتێبی «حاجی قادر...» گرتبایە کەم و زۆر خۆم لێ بە دەنگ نەدەهێنا.

ڕەخنەیەکی زۆر ڕەوای لێم گیرابایە ئەوە بوو کە لە لاپەڕە 29 ی «حەشارگەدا» گوتومە هەموو زماناسانی کورد چاویان بەسەر پاشگرێکدا کشاوە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن ئەویش پاشگری «ڕا» ی ڕێژەی «مبنی للمجهول» ـە.

من کە ئەمەم نووسی هەر ئەوەم بەرچاو کەوتبو کە د. عەبدوڵلا نەقشبەندی لە بارەی ئەم پاشگرەوە، لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوی کردبۆوە. دواتر لە کاتی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانیی لەگەڵ ئەندامانی «لیژنەی زمان و زانستەکانی» کتێبێکی ڕێزمانی قوتابخانەکانم دیت لەبارەی ئەم پاشگرەوەی نووسیوە. بە ڕاستی تا بڵێی دڵشکستە بووم بەو دۆزینەوە زۆر دواکەوتوەم. هەرچەند نەمدیت کەس سەهوەکەم ڕاست بکاتەوە، ڕەنگە ئەگەر خۆشم باسم نەکردبایە زەینی خوێنەرانی بۆ نەچووبایە، دیسان هەمیشە پێی سەغڵەت بووم و بە دوا دەرفەتدا دەگەڕام کە عوزرخوازیی لە نووسەرانی ئەو کتێبە بکەم.

بەڵام دەبێ شتێک ڕوون بکەمەوە لەبارەی ئەوەی کتێبەکەی قوتابخانە بۆ پاشگری «را» ی نووسیوە. کتێبەکە پاشگرەکەی تەنها بۆ کاری ڕابردووی تێپەڕ داناوە کە بکرێتە «مبنی للمجهول»، هیچ بۆ ئەوە نەچوە کە ئەم پاشگرە هەر خۆیەتی لە ئایندە (مضارع) دا دەبێتە «ڕێ» چونکە باسی

پاشگری «ڕێ» وەک پاشگرێکی سەربەخۆ دەکات، ئەمەش کەلەبەرێکی گەورەیە لەو باسە ڕێزمانییەدا چونکە ڕیژەی ڕابردوو و داهاتوو (ماضی و مضارع) لەیەکدی دادەبڕێت وەک ئەوەی کە هەریەکەیان لە سەرچاوەییێکەوە هاتبن. ئەوەی مەعلومە لەو پاشگرانەی بە فیعلەوە دەلکێن شتێکی بێ دەمەتەقەیە. پاشگری فیعل لە ڕابردووەوە بۆ داهاتوو – ئاینده - هەر یەک شتە و ڕواڵەتی دەگۆڕێ ئەمانەش نموونەی پاشگرەکانی «ا، کا، اند».

| ڕابردوو | ئایندە | چاووگ |
| --- | --- | --- |
| ترس«ا» م | دەترس«ێ» م | ترسان |
| ئاڵۆز«کا» م | دەئاڵۆز«کێ» م | ئاڵۆزکان |
| لەرز«اند» م | دەلەرز«ین» م | لەرزاندن |

پاشگری «را» ش وەک ئەمانە شێوەگۆڕیی دەکات:

| ڕابردوو | ئایندە | چاووگ |
| --- | --- | --- |
| دیت«را» م | دەدیت«رێ» م | دیتران |
| بیست«را» م | دەبیست«رێ» م | بیستران |

ئەوەی ڕاستیش بێ، نە بە چاک نە بە خراپ، هیچ حیسابێکم بۆ نووسینەکەی ناو کتێبی «سەرەتاییێک لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی» لە دانانی محەمەد ئەمین هەورامانی نەکردوە چونکە لەو کتێبەدا هەرچی هەیە دەبێ چاوی پێدا

بگێڕدرێتەوە و ڕاست بکرێتەوە. بە نیسبەت پێشگر و پاشگر و ناوگریشەوە کە لەو کتێبەدا باسیان کراوە چاوپێداگێڕانەوە بەش ناکات. دەبێ باسەکەیان سەرلەنوێ بنووسرێتەوە. بە نموونە، ڕاناوی «م، مان، یان...» وەک نیشانەی چاوگ بە «پاشبەند – پاشگر» دانراون (بڕوانە لاپەڕە 116، 117). لە سەرەتاکانی لاپەڕە 118 شدا «کێڵرا، کێڵراو» هەردویان وەک یەک بە «فرمان – فعل» حیساب کراون کە دەزانین «کێڵراو» ناوی بەرکار (اسم مفعول) ـە... خولاسە نووسینی ناو ئەو کتێبە هی ئەوە نییە دەسبژار بکرێت وبڵێی فڵانە شتم بەلاوە باشە یا خراپە...

ئێستا ڕێ بە خۆم دەدەم بپرسم، ئایا گوتارەکەی ڕۆشنبیری نوێ ناوی «کوردواتەنی» هەڵدەگرێ یاخود «کوردنەواتەنی»؟

لێرە بە دواوە دەقی گوتارەکەی «ڕۆشنبیری نوێ» لە چاپ دەدەینەوە تاوەک خوێنەر بتوانێ بەراورد لە نیوان ڕەخنەکان و وەرامەکانیاندا بکات. هەر بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانیش بگەڕێتەوە بۆ دەقی ڕەخنەکان، لێرەدا ستوونەکانی گوتارەکە ژمارەیان خراوەتە سەرێ بێ ئەوەی لە شکڵی ستووندا چاپ کرابن چونکە درێژایی و پانایی لاپەڕەکانی ئەم نامیلکەیە بەقەدەر هی گۆڤارەکە نابن، جا کە لە نامیلکەکەدا پەنجە بۆ ستوونێکی ناو گوتارەکە ڕاکێشرا بەهۆی ئەو ژمارەیەی لێرەدا بۆ ستوونەکە دانراوە دۆزینەوەی ئاسان دەبێ.

## زمانەوانی

## کوردواتەنی

محەمەد ئەمین هەورامانی

لاپەڕە «18»

«1»

زمان پڕ بە پێستی واتاکەی و بە پێی ڕەویە و ڕەوشت و پێویستی چەرخ و باو و برەوی، شان بە شانی دۆخەکانی پێشکەوتنی ئەو خەڵکەی کە بەکاری دەهێنن و گفتوگۆی پێ دەکەن، دەبێ لە ئاڵوگۆڕدا بێ و زمانێکی زیندوو و نەمەیی و بێ... وەختێ زمان، لە دۆخی خۆی مایەوە و گەشەی نەکرد و پەرەی نەسەند و لەگەڵ چەرخ و پێویستییەکانی ڕۆژانەی ژیان نەسووڕا، بێگومان ئەو زمانە مردووە!! مەییەوە!! وەستاوە!! چونکە ئەو خەڵکەی کە گفتوگۆ بەو زمانە دەکەن مردوون! بەشێوەیەکی ڕونتر، خەڵکێ نییە بەو زمانە قسە و گفتوگۆ بکەن!! بۆیە، وایە! چونکە تەنها ناوێکە، یان قاوغێکە، جگە لە چەند ڕەمز و وێنەیێ نەبن کە لە شێوەی چەند تێکستێکدان، هیچی تر نییە!! بۆ نموونە زمانی ئاوێستا چەند هەزار ساڵێ لەمەوبەرتر، زمانی سەرپاکی سەرانسەری خاکی کوردستان بووە، جگە لەوەش چەندەها گەلی ئێرانی تریش گفتوگۆیان

«2»

پێ کردوە و زمانی دینیی و قازییگەرییەتی سەردەمێکی دەوڵەتی ساسانییەکان بووە، سەرەڕای مانەوەی چەند تێکستێکی ئاوێستای پالەوییەکان — تێکستیی دینیی — و پەرسییەکان و ئاشکانییەکان و ساسانییەکان و چەندەها تێکستی تر کە بە زمانی ئاوێستاویی نووسراونەتەوە، سەرەڕای ئەوەش کەچی هێشتا ئاوێستا، ئێستە هەر بە زمانیکی مردو لە قەڵەم دەدرێ!! بۆچی؟ چونکی، حاڵی حازر، ئێستە گەلێ نییە گفتوگۆی پێ بکات، کە وابوو تەنها لە دۆخێکی مردوویەتیدا ماوەتەوە!!

لەمەی سەرەوەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە گەل و زمان لە ژیانا هاوسەری یەکترن، گەلێ زمانی تایبەتی خۆی نەبێ بە گەل لە قەڵەم نادرێ، زمانیش بە بێ ئەوەی گەلێ ببێ گفتوگۆی پێ بکات، بە زمان سەرژمێر ناکرێ! چونکە زمان و گەل، یاخود گەل و زمان هاوتەمەن و هاوبەخت و هاورۆح و هاوگیانن. هیچ کامیان لەوی تریان بەدەر نییە، لەبەر ئەمانە ڕواڵەتی مێژویی

«3»

زمان هینی گەل بەیەکەوە جۆش دراون — هەر لەبەر ئەوەشە، ئەگەر ویسترا بەسەرهات و دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕی باری ئابووریی کۆمەڵایتی گەلێ بزانی، یەکێ لەو ڕێگایانەی کە دەتگەیەنێتە ئاوات و ئامانج گرتنی ڕێگای لێکۆڵینەوەی مێژوویی ووشەیە - لە کوێوە هاتوە؟ لەکەیەوە هاتوە؟ - واتە «ئیتۆمۆلۆژیی وشەی زمان».

بەهۆی وردبوونەوەی مێژووی ئەو وشانەوە کە کەرەسەی زمانەکەیان دروست کردوە، هەن و نییەی ئەو وشانەمان بۆ دەردەکەوێ، ئەو وشەیە، لەکوێوە هاتوە!

بەهۆی چییەوە هاتوە، هۆی هاتنیی... واتای چی داوە، ئێستە واتای چی دەدات، لە چە دراوسێیەکەوە وەرگیراوە!... ! هتد.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە زۆر بە چاکی و چالاکییانە لایەکی گەورەی مێژوو و بەسەرهاتی زمانەکەمان، بۆ ڕۆشن دەکاتەوە.

لاپەڕە «19»

«1»

زمانی کوردیش یەکێکە لەو زمانانەی کە لە دێرین زەمانەوە تاوەکو ئێستە، هەر تەقڵ و دەویەتی ڕێگای پێچ پێچ و سەخت و ستەم و چاڵوچۆڵی پڕ لە کۆسپ و ناهەمواری ترسناک و نەهات دەبڕێ و هەرگیزیش ڕۆژێ لە ڕۆژان تا ڕادەیێ ترووکەی چاوێکیش، گەلی کوردی بەجێنەهێشتووە، پارێزگاریی ڕەسەنیەتی ڕێزمان و دەنگسازیی خۆی کردوە جگە لەوەش، نەرم و نیان بووە بەرامبەر ڕواڵەتی دنیا و ڕۆژگار بەوەی کە بە فراوانی، پێویستی ڕۆژانەی ڕۆژگاریی گەلی کورد و چەرخ، هەمە جۆر وشە و موفرەداتی بێگانەی وەرگرتوە- بە تایبەتی ئەوانەی پێویست بوون بە ژیانی ڕۆژانەی ڕۆژگاری کوردەواریی!!

ئەو وەرگرتنە، یاخود ئەو جۆرە وشە و موفرەداتی بێگانە قەرز کردنە، هەمەجۆر شێوە - زار — یان لە زمانی کوردیدا پەیدا کردوە! چونکە کەرەسە قەرز کراوەکە، لە لایەکەوە، لە ڕەگەزێکەوە نییە. بۆ نموونە، ئەو وشە و موفرەداتە فارسییانەی کە قەرز کراون، زۆر ڕواڵەتی شێوە گۆکردنی فارسییان پیوە دیارییە، تاوەکو لە ڕستەشدا، هەروەها قەرزکراوی تورکیش و عارەبیش...هتد.

بەم جۆرە بەهۆی ئەو قەرز کردن و مانەوە و تێکەڵییەوە چەند شێوەیێ پەیدا بوون!! چەند زاریێ دروست بوون!! جا، کامیان زۆر ڕەسەنی کوردایەتیی و کوردەواریەتیی تیادا ماوەتەوە؟! ئەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و قوڵی زمانی کوردییەوە و شێوەکانیەتی شان بە شانی ئیتۆمۆلۆژی ووشەکانی...

«2»

ئەم ئەرکە گرنگەش، ئیشی یەکێک و دوان نییە، کاری ساڵ و دوو ساڵیش نییە جگە لەوەش پێویستیی بە زروفێکی تایبەتیی گونجاو و یارمەتیەکیی پڕ لە زەڕکاریی هەیە...

بە پێی وردبوونەوەی ڕواڵەتی جوگرافیی، بۆمان هەیە بلێین، ئەو ناوچانەی زۆرتر لە بێگانەوە نزیکن ڕواڵەتی شێوەی زارەکوردییەکەیان زۆرتر بەلای ئەو زمانە بێگانەدا دایتاشیوە کە دراوسێیانە تا ئەو ناوچانەی ناو کرۆکەی کوردستانیان گرتۆتەوە!! بە تایبەتی ئەگەر هاتو ئەو ناوچە کرۆکانە جموجۆڵی ڕۆشنبیریەتییان تیادا بووا! ئەم وتەیەش لام وایە بەڵگەدار بێ، ئەگەر هەر هیچ نەبێ، هەر بە سەرپێیەکەوە بەرەو دواوە بۆ پەڕە پەڕە کردنی مێژووی دێرینی بەرهەم و تێکستی ئەدەبیی فۆلکلۆرییە نووسراوەکانی نەتەوەی کورد، ئەو وەختە بۆمان دەردەکەوێ کە زاری هەندە ناوچەیێ نەبێ، ئەوانی تر پاش چەند سەد ساڵی شوێنەواری زاراوەکەیان بەو جۆرە کە حاڵی حازر هەیە ون دەبێ!!

جا، پەرە پێدانی ئەو زارە کوردییە ڕەسەنەی کە زیاتر ڕۆشنبیران و خوێندەواران پێی دەنووسن و پێی دەخوێننەوە و — بەو هۆیەوە زیاتر ڕۆشنبیریی لە گەشەکردن و پەرەسەندندایە- ئەرکی سەرشانی هەموو

دڵسۆزێکی کوردە و هەروەها هی هەموو کوردێکی دڵسۆزیشە... بە پێچەوانەشەوە، هێنانە کایەی زاری تر دەبێتە هۆی جێگا لێژکردنی زارە ئەدەبییەکە، تا ڕادەیێ لاوازکردنی و سەر

«3»

لێشیواندن لە خوێندەواران و ڕۆشنبیران و لاوازکردنی جموجۆڵی ڕۆشنبیریەتیی...

ئێمە لێرەدا مەبەستمان تێکستی کەلەپووری نییە، واتە کەلەپووری نەتەوایەتیی بە هەر زارێ و شێوەیێ بێ پێویستە پارێزگاریی قەوارە و ڕواڵەت و شێوەکەی بکرێ، بەڵام بۆ لێکۆڵینەوە و دیراسەت کردن و توێژ هەڵدانەوە زاری ئەدەبیی کوردیی لە هەموو زارێکی تر سەرلەبەرترە...

ئەم سەرلەبەرییە، فراوانترە سوودبەخشتر دەبێ، ئەگەر هاتوو ئەم دامودەزگا کوردییانە کە هەن چاویان بڕیبێتە ئاگاداری کردنی ئەم خاڵە و ئەم ڕواڵەتە و بە تەنگەوەی گەشە کردنیەوە بن، بە شێوەیەکی تایبەتی ئەو دامودەزگا کوردییانە کە دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی کوردییان خستۆتە ئەستۆی خۆیان، وەک، کۆڕی زانیاری کورد و دام و دەزنای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیی و بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردیی و کۆمەڵی ڕۆشنبیرانی کورد و یەکیەتی نووسەرانی کورد...هتد

چونکە خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد زۆر بە پەرۆشەوە هەموو دەمێکی تینوویەتیی ڕۆشنبیرییان کردوەتە ئەم دامودەزگایانە و بە هیچ جۆرێ تینوویەتیی ڕۆشنبیرییان ناکوژێتەوە... جا، هەر لەبەر ئەوەیە بۆیە دەستی

هاریکاریەتیی بەشداری کردن لەگەڵ ڕۆشنبیراندا پێویستە درێژ بکرێ بۆ وەرگرتنی بیروڕای زانایانی کورد و کوردەوانییەکان زماننا‌سەکان بۆ هێنانەدی

لاپەڕە «20»

«1»

بەرهەمی بە پێزی وەها کە بکرێ بە دروشم، بۆ ژیاندنەوەی کەلەپووری کوردیی و سەرفرازکردنی لە دەست زەبر و جەوری تۆز و خۆڵ و ئاڵوگۆڕی چەرخ، چونکە جگە لە هەزارەها دەرس و عیبرەتی لێوە فێر دەبین، بە عەمبارێکی کەرەسەی قاموسی کوردیی کە لە دەمێکەوە چاوەڕوانی دەکرێ، لەقەڵەم دەدرێ – هەروەها بۆ گەشەپێدانی زمانە ئەدەبییەکە بە هێنانی وشە و موفرەداتی زادە کوردییەکانی تر بە شێوەیەکی زانستییانە بۆ ناو زارە ئەدەبییە یەکگرتوەکە...

بەم بۆنەیەوە، بە پێویستی دەزانم کە نەختێ دەمی باسمان بکەینە هەندێ وشە و موفرەداتێ کە لە چەند بەرهەمێکی ڕواڵەت زانستییانەی کوردییدا دەرچوون و ئومێدەوارین  کە باسی «محەمەد عەلی کلای» مان لە جیاتی نووسینی پێشەکییەک بۆ بەرهەمێکی زانستی نەکردبێ!!!

لە زۆربەی ناوجەکانی کوردستاندا وشەی «هەشارگە» بۆ جێگای خۆشاردنەوەی دڕندە، بە تایبەتی بە ڕۆژدا بەکاردەهێنرێ، واتە لە کوردەواریدا هەشارگەی گورگ، هەشارگەی بەراز باوە،... بەڵام هەرگیزا و هەرگیز نەبیستراوە بوترێ «هەشارگەی مەڕ»..

وشەی هەشارگە لێکدراوی

«2»

دوو وشەیە، کە ئەوانیش، «هۆشار» «گا-جا»ن.. واتە جێگەی پەنای دڕندە... بۆ نموونە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا دەوترێ «سەگی هەوشار»، بە واتای سەگێکی دڕندە، ئەنجا بەم پێیە «هەوشارگە» یاخود «هەشارگە» هەروەک وتمان واتای جێگا پەنای دڕندە ئەدات... لێرەدا، ئەوەی کە زۆر سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، کە نازانم بۆچی ئەم بەرهەمەی ئەم ناوەی پێوەنراوە! ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە بۆچی وشەی «هەوشارگە» یاخود «هەشارگە» کراوە بە «حەشارگە»، دوریش نییە کە بۆیە وا چەواشۆ کرابێ، بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی بازاڕ ڕاکێشێ!!!

با، ئیستەش چاوێ بە کتێبی «چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی» . لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد بخشێنین و بزانین ناوەڕۆکەی چی تێدایە. پێش هەموو شتێک باشتر وایە تەماشای «شل کردنەوە...» بکەین، کە نازانم هۆ چی بێ ئەم فرەیزی «شل کردنەوە» ی لە جیاتی «پێشەکی، دەسپێشخەری، یا، سەرەتای باوو بەکارهێنابێ»!!

لەم شل کردنەوەدا، هەندێ، یاخود ئەتوانین بڵێین کۆمەڵی هەڵەی ڕێزمانی بەدیی دەکرێن، کە کتێبی ڕێزمان، هەرگیز نابێ لە زمانەکەیدا هەڵەی ڕێزمانی هەبێ!! ئەمانەش، وەک کوردواتەنی، مشتێکن لە خەربارێک:

لە لاپەرە «5» دا، مامۆستای نووسەر نووسیویەتی و دەڵێ: «لەم نووسینەمدا نەختێک بەولای

«3»

باسە بەرچاوەکانی ڕێزمانەوە بۆ ناو هەندێک لە حەشارگەکانی دەستووراتی ڕێزمانی کوردییەوە دەڕۆم...».

بەبێ لادان، ئەم وشە و موفرەداتە ڕیزکراوانە لە چوارچێوەیەکی ڕێزمانی زمانی کوردییدا دانەڕێژراون، چونکە هەرگیز کورد ناڵێ «بەرچاوەکان»، بەڵکو کورد دەڵێ «ئاشکراکان» یاخود «دیارییەکان» یاخود «ئەوانەی کە لە بەرچاون» هەروەها لە کوردەواریدا ناوترێ «دەستووراتی»، بەڵکم دەوترێ «دەستووری» یاخود «دەستوورەکانی»، بەم پێیە، دەیتوانی ڕستەکە بەم جۆرە دابڕێژێ «لەم نووسینەمدا نەختێک بەولای باسە ئاشکراکانی ڕێزمانەوە بۆ ناو هەندێک لە دەستوورە پەناواکانی ڕێزمانی زمانی کوردییەوە دەڕۆم...».

هەر لە لاپەڕە چواردا دەڵێت «لایەنە یەکجار بزر و وردەکانی بچکۆلە ناڕێک و پێچەکانی ڕێزمان...» سەرنجێکی ئەم فرەیزە بدەین دەبینین کە لە واتا و ڕێکوپێکی بە پێی دەستووری ڕێزکردنی وشە لەسەر ڕێبازی زمانی کوردی زۆر لەنگە، چونکە ئەگەر شتێک یەکجار بزر بووبێ هەرگیز نادۆزرێتەوە، ئەگەر، هاتوو لە ئاسۆی دۆزینەوەشدا بوو ئەوە بزری یەکجار نییە!! جگە لەمەش هەروەک وتمان ڕیزی ئاوەڵناو و ناو وردەکاری تری فرەیزی ناو ڕستەی تەواو نییە. زۆر شتی زیادەی هێناوەتە ناویانەوە... لام وایە بەم جۆرە ڕێک بخرابایە باشتر دەبوو «لایەنە ورد و بزرە ناڕێکەکانی

لاپەڕە «21»

«1»

ڕێزمان...» بە شیوەیەکی ڕونتر نازانم چۆن ئەمانە یەک بە شوێن یەکەوە یەک کەوتوون «وردەکانی» و «بچکۆلە» و «ناڕێک» و «پێچەکەکانی» و «زۆر بزر»... هتد.

«...»

هەروەها نووسەر لە لاپەرە «4»دا دەڵێت «لەم نووسینەمدا خوێندەواری عادەتیشم لە حیسابان دەرهاویشتوە، بەولای خوێندەواری عادەتییەوە، ئەو ڕۆشنبیرەشم تێ نەخوێندۆتەوە کە دەخلێکی ڕۆشنبیرییەکەی بەسەر ڕێزمانەوە نییە...».

وشەی «حیسابان» هی کوێرە دێیەکە، ئەگەر زۆر بە فراوانیش بەکار بێت هەرگیز لە ناوچەیەکی بچکۆلە زیاتر تەجاوەز ناکات، جا نازانم چۆن لێرەدا لەسەر چە پەیڕەوێ بەکار هاتووە! خۆ زاری ئەدەبیی نییە وا!! ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی کەوە، لەو باوەڕەدا نیم مافی دیاری کردنی خوێندەواری عادەتی و ڕۆشنبیریی درابێ بە یەکێ، یاخود سەنگی مەحەکێکی تایبەتی بۆ ئەم جۆرە کێشانە و پێوانە دانرابێ!! هەندێ ڕواڵەت و سیفەتێ هەن ئەگەر بدرێن بە ڕۆشنبیریی زماناس، لام وایە هەروەک نووسەر مافی هەیە دەربارەی زمان و زمانناسییەوە بنووسێ، هەروەها هەموو ڕۆشنبیرێکی تری کورد ئەو مافەی هەیە، ئەگەر هاتو بڕوانامەی پسپۆڕی و جۆرە قەباڵەی تر لەم ڕووەوە نەخوێزانەوە و پشت گوێ خران!!

وشەی «حیسابان» «دەرهاویشتوە» ش هەروەک ئەوانەی پێشوون زۆر کەم جێگای

«2»

کوردستان هەن کە خەڵکەکەی ئەم وشانە بەم جۆرە بەکاربهێنن، ئەوەش نابێتە بەڵگە بۆ هێنانە ناوەوەی ئەم وشانە و بەم جۆرە، ئەوە لە کوردەوارییدا باوە دەڵێن «... لە حیساب دەرهێناوە...» نەک «... لە حیسابان دەرهاویشتوە...». ئێمە قسەمان لەسەر داڕشتنی ئەو ڕستەیەی سەرەوەیە!

لە لاپەڕە «3» دا مامۆستای نووسەر باسی دەنگ دەکات، کەچی وا دیارە هێشتا جیاوازیی نێوان «پیت» و «دەنگ» ناکات بەوەی کە دەڵێت، «...

دەنگی لامە قەڵەوەکەی...». ئەگەر لامی قەڵەو بێ، ئەوە «پیت» ە ئەگەر مەبەستی دەنگیش بێ، دەبوایە بیوتایە دەنگە قەڵەوەکەی «ل» ە، واتە ئەو ڕەمزەی کە بۆ دەنگ دادەنرێ بێگومان دەبێ جیاوازیی ڕواڵەتی تەواوی لەگەڵ ئەو پیتەدا هەبێ کە لە شێوازەی وشەدا ئەو دەنگە دەدات. بۆ نموونە «لامە» قەڵەوەکە - تەنها «لامە» کە - بریتییە لە چوار دەنگ «دوو بزوێن» و «دوو کۆنسونانت»... ئا ئەمەیە کاری فۆنەتیک، ئەگەر دەپرسی فۆنەتیک چیمان بۆ دەکات!!.

لە لاپەڕە «3» دا نووسەر دەڵێ «... دەمیان لە فارسی وەردا...». لە کوردەواریدا دەڵێ «... دەمیان لە فارسی وەردا...». لە کوردەوارییدا دەڵێ «ئاو لە دەمت وەردە...» هەروەها دەڵێن، «... دەمی لە فارسییەوە داوە» هەرگیز نەبیستراوە بوترێ «دەمی لە فارسییەوە وەرداوە!» لە لاپەڕە «8» دا نووسەر چەند جارێ

«3»

فرەیزی «جووجەڵەی کەو» ی بەکارهێناوە... کە بێگومان ئەمە زۆر دورە لە کوردواتەنییەوە و واش لە قەڵەم دەدرێ کە ئەمە تەنها لە لایەن نووسەرێکی سەرمێزەوە ناشارەزای هەن و نییەی خەڵکی کوردستان و کوردەوارییەوە نووسراوە. چونکە کورد هەرگیز نەی وتوە «جووجەڵەی کەو»، ئەوەی لەم ڕووەوە وترابێ، تەنها «جووجەڵەی مریشک» ە، بەڵام «کەوباڕ» و «باڕەکەو» و «گووار» «کوڤار» باوە و بە وردیلەی کەو وتراوە...

«...»